زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ
ژمارە (٣٢)

# بادیەی عیشق

## مەحوی ..

## لە چەند لێکۆڵینەوەیەکدا

ئامادەکردنی
حەبیب محەممەد دەروێش

٢٠١٧

**پێناسەی کتێب**

**ناوی کتێب: بادیەی عیشق، مەحوی لە چەند لێکۆڵینەوەیەکدا**
**بابەت: لێکۆڵینەوە و دیدار**
**نووسەر: حەبیب محەممەد دەروێش**
**دیزاینی ناوەرۆك: حیکمەت مەعروف ( ئالین دیزاین)**
**دیزاینی بەرگ: هەرێم عوسمان**
**نۆبەتی چاپ: یەکەم**
**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**

**ژ. سپاردن: لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**
**ژمارەی (           ) ی ساڵی (٢٠١٧) پێدراوە.**

## پێڕست:



دەزانم بادیـەی عیشـقە خـەتەرناك

کەچی هـەر چــووم، ئەگەر مام و ئەگەر چووم

لە حینی نەزعی رۆحـا، رۆحـی عاشق

وتـی، ئـۆخـەی لـە میحنەت خـانە دەرچــــووم

بـە ئۆغرکردنی من بوومە قەقنەس

کـە ئـەو چـوو بـۆ سەفەر من بۆ سەقەر چووم

وتی قەت وا مەیە،من واوە هەر دێم

نـەهات ئـــەو وا قــەت و مــن واوە هــەر چووم

شـــوکر مــوورم بــووە پــاماڵی میرێ

بــەبێ نــامی ژیـــام و نـــامــوەر چــــــووم

غەمی قاتیلمە (مەحوی)!مونفەعیل ما

لـــە حـەشـــرا کفنی خـوێناوی بـە بـەر چووم

## پێشەکی:
## بۆچی (مەحوی) مان هەڵبژارد؟

ئاساییە بپرسرێ بۆچی (مەحوی)، نەك شاعیرێکیدیکەی کورد یا هەر بابەتێکی گەرمی ئەمڕۆ، بۆ ئەم کتێبە هەڵبژێردرا! ؟ ئاساییبوونی ئەم پرسیارە لەوەدایە کە دەبێ ئەوەی شتێك هەڵدەبژێرێ بزانێ بۆچی هەڵیبژاردووە و ئەو هەڵبژاردنەشی بۆ ئەمڕۆی کورد چیدەگەیەنێ، لە چ بوارێکدا خزمەتدەکات و تاچەند دەتوانین لەو بۆچوونەمان دڵنیابین! ؟.

پێش هەموو شتێك پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە "مەحوی" شاعیری سۆفی بووە و ئەوەش یەکێکە لە هۆکارەکانی ئەم هەڵبژاردنە، بەڵام کورد شاعیری سۆفیی زۆرە لەوانە: "مەلای جزیری، مەولانا خالید، شێخ عەبدوڕڕەحمانی تاڵەبانی، مەولەوی، شێخ قادری تاڵەبانی – فائض–ی برای شێخ رەزای تاڵەبانی و.. تاد.

شیعرەکانی (مەلای جزیری)، وێڕای ئەوەی بە دایەلێکتی کرمانجی سەروو نووسراون، هێندەش بە وردی زاراوەکانی بواری سۆفیگەرییان تێدابەکارهێنراوە کە ناتوانرێ تەنانەت پاش شیکردنەوە و لێکدانەوەش، پەی بە ئاراستەی گشتیی مەبەستەکانی ببرێت. مەولانا خالد و شێخ عەبدوڕڕەحمان زۆربەی شیعرەکانیان رێك زۆر جوانەکانیان بە فارسی نووسراون . شیعری کوردییەکانی

مەولانا پتر بە شێوەزاری (گۆران) نووسراون و هێندەی شیعرە فارسییەکانیش سۆزیان بەسەرەوە زاڵ نییە. شیعرەکانی "مەولەوی"ش هەر بە شێوەزاری گۆران نووسراون. شیعرەکانی شێخ قادری (فائض) بە زمانی تورکی نووسراون. لەم نێوانەدا تەنها شیعری (مەحوی) بە دایەلێکتی (کرمانجی خواروو)– شێوەزاری باوی سۆرانی– نووسراون و گۆڤاری "کۆچ" بەو شێوەزارە دەردەچێت و زۆربەی خوێنەرانی هی ئەو شێوەزارەن. ئەمە نە بەو مەبەستەیە کە هەوڵبدرێت "کتێب"ەکانی ئەو گۆڤارە تایبەتبن بە سنوورێکی جوگرافیایی دیاریکراوی کوردستان و نە بەو مەعنایەشە کە ناتوانرێ بە دایەلێکتێکی دیاریکراوی زمانی کوردی لێکۆڵینەوە لەبارەی شاعیرێکەوە بکرێ کە دایەلێکتەکەیدیکەی بەکارهێناوە. نەك هەر ئەوە، بەڵکو دەتوانرێ زمانێکی دیاریکراو بۆ لێکۆڵینەوەی شاعیرانی گەلانیدیکەش بەکاربهێنرێت، بەلاَم ئەگەر شاعیرەکە زمانێکی پڕڕەمز و زاراوەی تایبەتی بواری هەستیاری وەکو ئەزموونی سۆفیگەریی بەکارهێنا، ئەوا پێمانوایە باشترە بە هەمان زمان و تەنانەت بەهەمانشێوەزاریش لەسەری بنووسرێت.

لەمانەش بەولاوە،(مەحوی) یەکێکە لەو شاعیرە کوردە بە ژماوە کەمانەی لە لوتکەی داهێناندان. بۆچوونی گشتیی ئێمە ئەوەیە کە دانانی تەنها شاعیرێك لە لوتکەدا نە کارێکی زانستییە و نە پێوەرەکانی رەخنەی ئەدەبی رێگە بەوجۆرە حوکمە دەدات، چونکە بەو پێوەرە بەتەنها لە لوتکەدابوون مەعنای لە لوتکەدابوونە

لە هەموو ڕوویەکەوە و بەهەموو پێکهاتە جوانیگەرییەکانەوە، چ پەیوەندیی بە شێوەوە هەبێت یان ناوەڕۆك یان هەر مەسەلەیەکی پەیوەست بە چێژ و ئاسانیش نییە هەموو ئەمانە بۆ تەنها شاعیرێك بسەلمێنرێت. ویژدانی ئازاد و نادەمارگیر ڕێگە بەوجۆرە حوکمانە نادات و لە بەرژەوەندیی هیچ لایەك و پێش هەموو شتێکیش لە بەرژەوەندیی ڕەوتی ڕەخنەی ئەدەبیی پشتئەستوور بە بابەتگەرایی نییە جڵەو بۆ حوکمی پەلە و سەرپێیی شلبکەین.

دەرەنجامی هەرە خراپی ئەوجۆرە حوکمانە ڕاهێنان و پەروەردەکردنی نەوەکانی داهاتوومانە بە گیانی داوەریکردنی پشتنەبەستوو بە بەڵگە و ئەمەش ئەو دەردەیە کە ئەدەب و مێژوو و تەنانەت هەموو لایەنەکانی چالاکیی ڕۆحیمان بە دەستییەوە دەناڵێنن.

بەو ئاواتەی ئەم کتێبە بتوانێ سەرکەوتووانە تەنها یەك پرسیاری جیددی و بەجێ بورووژێنێت و لە ئەنجامی ئەوەشدا هەوڵی ڕاستەقینە بخرێتەگەڕ بو وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە و بەرهەمهێنانی پرسیاریدیکەش، وا بەری هەوڵێك دەخەینە بەردەست و دیدەی عاشقانی ئەدەبی گەلەکەمان و چاوەڕوانی ئەو هەڵوێستەین کە چاو لە کەموکووڕییەکان ناپۆشێت، بەڵام چاوەڕوانی ڕەخنەی زانستیین نەك ململانێی پشتبەستوو بە بەرژەوەندییە جیاوازەکان.



## ژیاننامەی مەحوی

## ئامادەکردنی: حەبیب محەممەد دەروێش

هەموو سەرچاوەکان لە رووی رەچەڵەکەوە تەنیا ئاماژە بەوە دەکەن کە مەحوی ناوی: **محەممەد** کوڕی مەلا وەسمانی باڵخییە و لەوە زیاتر باسی پشتەکانیتری ناکرێ.

ناوی مەحوی بەپێی هەندێك سەرچاوە: **محەممەد** کوڕی مەلا وەسمانی باڵخییە و نەوەی شێخ رەشی زانای بەناوبانگە و هەندێکیش دەڵێن: **محەممەد** کوڕی شێخ وەسمانی باڵخییە.. مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسیش ئاوا ناویدێنێ: مەلا **محەممەد** کوڕی مەلا عوسمانی باڵخی لە نەوەی پیر و زانای ناودار (شێخ رەش).. مامۆستا لە کتێبی بنەماڵەی زانیاراندا بەوە دەکات کە مەلا عوسمان پاشمەرگ بووە و لەسەر وەسیەتی باوکی ناویانناوە عوسمان.. مەلا عوسمانی باوکی مەحوی بە مەلا عوسمانی بچووك ناسراوە و کوڕی مەلا عوسمانی گەورەی باڵخییە.. هەموو سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە مەحوی لە شاری سلێمانی لەدایکبووە.

لەبارەی ساڵی لەدایکبوونیەوە بیروڕای جیاواز دەردەکەوێ و زۆربەی نووسەرانیش ئاماژە بەوە ناکەن کە زانیارییەکانیان لە چ سەرچاوەیەکەوە پەیداکردووە.. مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە کتێبی (دیوانی مەحوی)دا ئاماژە بە هێنانەوەی زانیاری لە مێژوونووس **محەممەد** ئەمین زەکی بەگ دەکات کە دەڵێ ساڵی ١٢٥٢ی

کۆچی کە دەکاتە ١٨٣٦-١٨٣٧ لەدایکبووە.. کاکەی فەلاحیش دەڵێ لە ساڵی ١٢٤٧ی کۆچی کە دەکاتە ١٨٣١-١٨٣٢ لەدایکبووە.. مامۆستا عەلادین سەجادیش دەڵێ ساڵی ١٢٤٦ی کۆچی کە دەکاتە ١٨٣٠-١٨٣١ لەدایکبووە.. د. مارف خەزنەدار دەنووسێ ساڵی ١٨٣١ی زایینی لەدایکبووە.. سدیق بۆرەکەییش دەنووسێ ساڵی ١٢٤٥ی کۆچی کە دەکاتە ١٨٢٩-١٨٣٠ی زایینی.. هەرچی نووسەرانیتریش هەیە کە لەبارەی ساڵی لەدایکبوونیەوە وتوویانە هەر لە چوارچێوەی ئەو ساڵانەدایە و شتیتریان نەوتووە..ئەوەی دەزانرێ مێژوونووس **محەممەد** ئەمین زەکی بەگ و مامۆستا عەلادین سەجادی یەکەمین کەسەکانن کە مێژووی ژیانی ئەو شاعیر و کەسایەتییە کوردانەیان نووسیوەتەوە بەپێی ئەو زانیارییانەی چنگیانکەوتووە.

مەحوی لە ئامێزی خێزانێکی مەلازادەدا پەیدابووە و سەرەتای ژیانی لە حوجرەدا لای باوکی خوێندوویەتی و بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی دەچێتە شارەکانی سنە و مهاباد و ٣ ساڵ لای مەلا عەبدوڵڵای پیرەباب خوێندوویەتی و دەچێتە شنۆش و ئینجا دەگەڕێتەوە سلێمانی و دواتر چووەتە بەغداد و لای مفتی زەهاوی لە بەغداد خوێندن تەواودەکات و مۆڵەتی مەلایەتی وەردەگرێ و ساڵی ١٨٥٩ی زایینی لە مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم لە بەغداد دەبێتە مامۆستای وانەبێژ.. ساڵی ١٨٦٢ی زایینی دەگەڕێتەوە سلێمانی و دەبێتە ئەندامی دادگا تا ساڵی ١٨٦٨ی زایینی بەردەوامدەبێ و ئیتر وازدەهێنێ.. مامۆستا شێخ **محەممە**دی خاڵ لە کتێبی (مفتی زەهاوی)دا باسی مەحوی دەکات کە ساڵی ١٢٩١ی کۆچی کە دەکاتە ساڵی ١٨٧٤-١٨٧٥ی زایینی لەگەڵ چەند

مەلایەکیتردا بۆ بەغداد دووردەخرێنەوە، بە روونی باسی ئەوە ناکات بەچ هۆیەکەوە دووردەخرێتەوە، بەڵام هەندێ ئاماژە هەیە گوایە هەستە ئایینییەکەی وایلێکردبێ بەگژ دیاردە بۆگەنە کۆمەڵایەتییەکاندا بچێتەوە و هەندێکجاریش خۆی لەقەرەی ناڕەزایی لە سیستمی حوکمداریش بدات کە لەوانەیە هەر ئەمە وایکردبێ رۆژێك لە رۆژان رەهەندەی بەغداد بکرێ.. ساڵی ١٨٨٣ی زایینی دەچێتە حەج و لە گەڕانەوەیدا سەردانی ئەستەمبوڵ دەکات و لەوێ چاوی بە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دەکەوێو سوڵتانیش کەسێتی ئەوی دەچێتە دڵەوە و رێزی زۆری لێدەگرێ و خەڵاتی دەکات و بڕیاری دروستکردنی خانەقایەکی لە سلێمانی بۆ دەدات و لەدواتردا مەحوی بە بۆنەیسەرکەوتنی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە بەسەر گەلی یۆنانداشیعرێکی بۆ هەڵبەستووە کە تیایدا هاتووە:

**فەتح و زەفەر بە ناوی کێ بێ؟ خەلیفەی ئیسلام**

**(عەبدولحەمید)ی غازی، سوڵتانی روبعی مەسکون**

ئیتر تا دواساتەکانی تەمەنی لە خانەقاکەیدا خۆی بە دەرزوتنەوە بە فەقێکانی خەریکدەکات تا رۆژی لەدنیادەرچوونی.

لەبارەی ساڵی مردنەکەیشی بیروڕای جیاواز هەیە و هەرکەسە ساڵێك دیاریدەکات: مامۆستا عەلادین سەجادی ساڵی ١٩٠٤ی زایینی و د. مارف خەزنەدار ساڵی ١٩٠٦ی زایینی و سدیق بۆرەکەیی ساڵی ١٣٢٤ی کۆچی و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسیش هەر ساڵی ١٣٢٤ی کۆچی بۆ لەدنیادەرچوونی دادەنێ و لە کتێبی بنەماڵەی زانیارانیشدا دەڵێ ساڵی ١٩٠٤ی زایینی لە جیهان دەردەچێت..

بێخودی شاعیریش بە دێڕە شیعرێکی فارسی باسی ساڵی مردنەکەی دەکات کە دەڵێ:

**چو بشنید (بیخود) وفات سلف**

**بتاریخ گفتا: "عمر ما شد خلف"**

ئەم "عمر ما شد خلف" بەپێی پیتی ئەبجەدی دەکاتە: ١٣٢٤ی کۆچی.

مامۆستا عەلادین سەجادی وەسپێکی کەسێتی مەحوی دەکات کە: پیاوێکی بالاّبەرز و کەڵەگەت، سووروسپی و چاوگەورە و ریشێکی درێژی پێوەبوو.. بەنەرمی و لەسەرخۆ قسەیکردووە، مێزەری سپی کوردانەی لەسەرناوە و کەواوسەڵتە و جوببەی لەبەرکردووە.

دیارە هەلومەرجی ژیانی خێزانی وای لە مەحوی کرد ئەویش لە ئاستانەی سۆفیگەریدا خۆی ببینێتەوە و ببێتە شاعیر، شاعیرێکی سۆفیگەری.. چونکە باوکی سۆفی و خەلیفەی شێخی سیراجەدینی تەوێڵە بووە کە ئەویش خەلیفەی حەزرەتی مەولانا خالیدی شارەزووری بووە، ئەمەش کاریگەرێتی لەسەر مەحوی دروستدەکات و ئەویش هەمان رێچکەی سۆفیگەرێتی دەگرێتەبەر و دەبێتە سۆفی و خەلیفەی شێخی بەهادین.. هەرچەندە باسی ئەوە دەکرێ کە مەحوی لە سەرەتای ژیانیدا کەسێك بووە زۆرتر حەزی لە گۆشەگیریکردووە، بەلاّم ئەمە وای لێنەکردووەکە سۆفییەکی دوورەپەرێز و بێئاگابێ لە دنیای دەوروبەر بەڵکو لە ئاستێکی بالاّدا پەیوەندی بە سوڵتان عەبدولحەمیدەوە دەکات.

وەنەبێ لەناو کورددا پێش مەحوی شیعری سۆفیگەری نەبووبێ، بەڵکو شاعیرانی وەکو: بابا تاهیری هەمەدانی و مەلا پەرێشان و مەلای جزیری و سەید سالْحی نیعمەتوڵلاهی، لەسەر ئەو رێبازەی سۆفیگەری شیعریان نووسیوە و خۆشیان سۆفی بوون، بەلاّم مەحوی لە هەموویان زۆرتر لەو بوارەدا قووڵبووەتەوە و کاتەکانی خۆی بۆ تەرخانکردووە و بگرە رێچکەیەکی لەم بوارەدا دروستکردووە.

مەحوی لە نەوەی دووەمی قوتابخانەی نالییە و یەکێکە لە چڵەپۆپەکانی شیعری کلاسیکی کوردی کە شیعرەکانی بە زمانی کوردی پاراو داناوە..وردەکاری زۆری کردووە، ئەمەش قووڵییەکی فەلسەفی بە شیعرەکانی بەخشیوە..لەمەشەوە دەگەینە ئەوەی کە هەرچەندە زمانی شیعری مەحوی قورسە و تێگەیشتنی گرانە، بەلاّم دەربرینێکی پاراو و رەوانی هەیە. مەحوی زۆرترین بەحرە عەروزییەکانی کێشی عەرەبی بەکارهێناوە، لە رووی قافیەشەوەهەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی بەکارهێناوە، لە رووی رەوانبێژییەوە شاعیرێکی شارەزا و وەستایە.. زۆر بایەخی بە تێهەڵکێش وەرگرتن لە قورئانەوە داوە.. وشە و رستەی عەرەبی زۆر کەوتووەتە ناو شیعرەکانیەوە.

هەر وەکو وترا مەحوی شاعیرێکی سۆفی بووە لە بواری سۆفیگەری و خواپەرستیدا رێچکەیەکی تایبەتی گرتووە و زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی ئایینییەو لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی بووە کە تیایدا تەریقەتی بۆ شەریعەت بەکارهێناوە، هەروەکو نەقشبەندییەت بۆ خۆی رێبازێکی یاخیگەرانەی سۆفیزمییە، مەحویشسۆفییەکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو سۆفییەکی یاخیبووە، بۆیەشیعری دژە سۆفیزمیشی زۆرە کە پڕە لە

تانووتدان لە شێخ و سۆفی و زاهید و واعیـز و دەروێشـە درۆزنـەکـان رەخنەی لێگرتوون کە بەناوی ئایینەوە یارییان بە ئـاوەزی خـەڵـکیـی کردووە.. لەهەمانکاتدا غەزەل و شیعری وەسف و چوارین و تـاکـیـشـی هەیە.

مەحوی هەر سێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی بـە بـاشـی زانیوە و هەروەکو باویشە هەموو شاعیرانی کلاسیکی کورد بەو زمانانەی زانیویانە شیعریان نووسیوە.. هەر بۆیەشە ئاساییە شاعیرانی عـەرەب و فارس کاریگەرێتییان لەسەر مەحوی دانابێ نەك لە رووی رووخسـارەوە بەڵکو لە رووی ناوەڕۆکی شیعریشەوە.. بەتایبەتی کە مەحوی شاعرێکـی سۆفی بووە کاریگەرێتی حافیز و سـەعـدی و مـەولانـای رۆمـی و شەبووستەری فارسی لەسەرە، هەروەکو کاریگەرێتی ئـیـبن عـەرەبـی و مەنسوری حەللاج و زەننونی میسری و ئیبن فاریز و رابیـعـەی عـەدەوی لەسەرە.. جگەلە کاریگەرێتی حەزرەتی مەولانا خالیدی شارەزووری کـە مەحوی لەسەر رێوڕچە و رێبازەکەی ئەو بووە.

بەلای هەندێکەوە مەحوی شاعیری سۆفیزم نەبووە و ئەو شیعرانەی وەکو دژایەتیکردنی دەسەڵات و خەڵکە خراپەکە وتووە و نموونـەی لـە تێکۆشانی مەنسوری حەللاج و سۆفییەکانیتر هێناوەتەوە.. بەڵگەش بـۆ ئەمە نەفیکردنی مەحوییە لەگەڵ کۆمەڵێك مەلایتری شاری سلێمانی بـۆ شاری بەغداد.. پێچەوانەی ئەمە هەندێکیتر وای بۆ دەچن مەحوی هـیـچ هەڵوێستێکی سیاسی نەبووە و چەندین رووداوی سیاسی روویداوە مەحوی هیچی لەبارەیەوە نەوتووە، بگرە سەردانی دەرباری عوسمانـی کـردووە و رێـزی لـێـگـیراوە و خـەلاتـیـش کـراوە.. ئـەمـەش مـرۆمشـتـی

کوردایەتیەتیکردنی مەحوی لێکەوتووەتەوە کە هەندێك دەڵێن کوردایەتیکردووە و هەندێك بەپێچەوانەوە دەڵێن بەلای ئەوەدا نەچووە و تەنیا خواپەرستیکردووە.. هەندێك دەڵێن مادام شیعری بە کوردی نووسیوە و لە شیعر نووسیندا خۆی نەخستووەتە خانەی زمانی خەڵکیترەوە ئەوە کوردایەتییە.. دیسانەوە مادام شیعری خواپەرستی و سۆفیگەری بە کوردی نووسیوە ئەوە کوردایەتییە بە واتا سیاسییە بەرتەسکەکە نا، بەڵکو بە واتای خزمەتکردنی نەتەوایەتی:

**بنووسە، پیری دڵم ئەمریکرد، ئیتاعەمکرد**
**لە ئیبتیداوە کە بەیتی موناسیبی دیوان**
**گەدایەکی وەکو مەحوی، قەلەندەرێکی کورد**
**میسالی پادشەهی فورسە ساحیبی دیوان**

مەحوی هەڵوێستی سیاسی هەبووبێ یان نە، کوردایەتیکردبێ یان نە، شاعیرێکی گەورەی نەتەوەی کوردە و لە بالایی کەسێتی ئەو کەمناکاتەوە و مایەی شانازیشە بۆ کورد و مێژووی ئەدەبی کوردی بە شیعرەکانی دەوڵەمەند کردووە.

یەکەمجار دیوانی مەحوی ساڵی ۱۹۲۲ لەلایەن مامۆستا عەلی کەمال باپیر ئاغاوە لەچاپدراوە و دواتر مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی دیوانەکەیان بە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەوە ساڵی ۱۹۸٤ بلاوکردەوە. ئەمە جگەلەوەی لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر کراوە و دەکرێ چ وەکو کتێب و چ وەکو وتار لە گۆڤارەکاندا و بگرە دیداریشی بۆ

کراوە، بەلاّم هێشتا مافی تەواوی نەدراوەتیێ و پێویستدەکات لەلایەن پسپۆڕان و شارەزایانی بواری ئەدەب و سۆفیگەری زۆرتر کاری لەسەر بکرێ تاکو زۆر گرێوگۆڵ و مەبەستی نادیار پەیپێببرێت و روونبکرێتەوە.



**سەرچاوەکان:**


دیوانی مەحوی/ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

مێژووی ئەدەبی کوردی/ عەلادین سەجادی

مێژووی ئەدەبی کوردی/ د. مارف خەزنەدار

مێژووی وێژەی کوردی/ سدیق بۆرەکەیی

دیدی نەتەوەیی و نانەتەوەیی/ د. حسێن محەممەد عەزیز

مەحوی/ ئەحمەدی مەلا

ژیناوەری زانایان/ محەممەد سالّح ئیبراهیمی

مشاهیر کرد وکردستان/ محمد امین زەکی بیك

خلاصە تاریخ کرد وکردستان/محمد امین زەکی بیك

تاریخ السلیمانیە وانحاؤها/محمد امین زەکی بیك

مەحوی میراتگری پەیام و هەلّوێستی جوامێرانەی مەولانا/ حەمەد حەمە باقی

## مـــــەحوی و میتـــــۆد
## لێـکۆڵینـەوەی هـەردوو چـەمـکی "مـەنهەج" و "ڕێ"
## لە شـیعرە کوردییەکانی "مەحوی"دا
## عەبدوڵڵا قەرەداغی

### یەکەمین بەش
### پێشەکی

ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر بنەمای ئەو گریمانـە "هـایـپـۆتـیـز"ە بنیاتنراوە کە مەحوی خاوەن میتۆدی تایبەت بە خۆی بووە و ئـەمـەش نەك هەر لەو جیهانبینییەیدا دەردەکەوێ کە لەئەنجامی خـوێـنـدنـەوەی وردی شیعرەکانیدا بۆ خوێنەر ڕووندەبێتەوە، بەڵکو لە بەشێکـی بـاشـی شیعرەکانیدا بێپەردە ئاماژەی بۆ دەکات و جگەلە وشەی خاوەن هێـمـای ڕوون و تایبەتی "مەنهەج"، وشەیدیکەی وەکو "ڕێ"ش بەکاردەهێنـێـت کە دەقاودەق هەمان مەبەست دەگەیەنێت. ئەم ڕاستییەش، پێش هەمـوو شتێکیدیکە، ئەوە دەخاتەڕوو کە ناکرێ چیدی تەنها لە ڕوانگەی شیعری ئاساییەوە بڕوانینە شیعری مەحوی و ئاوڕ لە جیهانی جیاواز و تایبـەتـی ئەو شیعرە نەدەینەوە یان ئاوەها بە ئاسانی خۆمان بسپێرین بە حوکـمـی خێرا و سەرپێیی زاڵبوونی "فەرهەنگی شیعری" بەسەر ئەدەبی کـوردیـدا بەگشتی و بەوەش خۆمان لە ئەرکی لێکۆڵینەوەی ڕاستییەکان بدزینەوە.

لەسەر بناغەی ئەم گریمانەیەش، ئەرکی سەرەکیی ئـەم کـۆشـشـە بریتیدەبێتلە چاوبڕین لەو دەقانەی ئاماژەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیان

بۆ "میتۆدی مەحوی" تێدابەدیدەکرێت و شیکردنەوەیان لەسەر بناغەی "میتۆدی شیکردنەوە"بێئەوەی هەوڵی بەزۆر لەبەرکردن"تحمیل"ی تێدابەکاربهێنرێ.

گرنگیی هەوڵێکی ئاوەها، بە بۆچوونی بەندە، تەنها لەوەدا نییە کە ئاراستەی "سیستماتیکی – مەنهەجی"ی بیرکردنەوەی شاعیرێکی وەکو "مەحوی" دەخاتەڕوو، بەڵکو ئەوەش دەسەلمێنێ کە داهێنانی ئەو کەڵە شاعیرانەمان تەنها پشتی بە"بەهرە" نەبەستووە، بەڵکو پێش هەموو شتێك پشتی بە فەرهەنگێکی رەسەن و بەرچاوڕوونیی راستەقینەی بنیاتنراو لەسەر بناغەی بوونی "جیهانبینی"و "میتۆد" بەستووە و هەر ئەمەش "فرەلایەنی"ی بە بیری داهێنەریان بەخشیوە و لە راستەوخۆیی و "رووکەشخوازی – السطحیة"ی شیعری پاشتر تائەمڕۆ رزگاریکردوون.

لە بواری لێکۆڵینەوەی مەسەلەیەکی ئاوەهادا رەچاوکردنی بۆچوونی لێکۆڵەرانیدیکە گرنگە کە بەداخەوە هێندەی بەرچاو و گوێش کەوتبێ نەمزانیوە کەس خۆی بەم لایەنەوە خەریککردبێ، ئەمەش کێشەی هەرە گەورەی بەردەم ئەم کۆششە بوو، بۆیە ناچار تەنها پشتم بە شیعرە کوردییەکانی "مەحوی" خۆی بەستووە، بەلاّم لە بواری "میتۆد" خۆیدا سەرچاوە و ئاماژەی پێویستم بەکارهێناوە.

## چەمکی میتـــۆد

لەبەرئەوەی ریشەی ئەو وشەیە لە زمانەکانی ئەوروپادایە، نـاکـرێ لە بناغە زمانەوانییەکانی وشەی "منهج"ی عەرەبی بگەڕێین، ئەگەرچـی لە رووی زاراوەوە هەمان مەعنای هەیە و وشەی "میتۆد"یش هـەر بـە وشەی "منهج" وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و بەکارهێنانـی ئـەو وشەیەش لەو زمانەدا زۆر کۆنە، لە قورئانی پـیرۆزیشـدا بـە شـێـوەی "منهاج" هاتووە: (وَأَنْزَلْنا إِلَيْكَ الْكِتابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِما بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِما أَنْزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْواءَهُمْ عَمَّا جاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهاجًا وَلَوْ شاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً واحِدَةً وَلكِنْ لِيَبْلُوَكُمْ فِي ما آتاكُمْ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْراتِ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُمْ بِما كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ./ المائدة ٤٨)

خودی پێغەمبەریش (س) وشەی"منهج"ی بەکارهێنـاوە هـەردوو وشەکەش هەر مەعنای "رێ – رێگە" دەبەخشن [١].

وشەی میتۆد"Method" لە زمانی ئینـگـلـیـزی و زمـانـە زیندووەکانیدیکەی ئەوروپا، بناغەدا، لە وشەیەکی یۆنانییەوە وەرگـیراوە کە مەعنای"گەڕان، یان دیدگە یان زانیاری دەبـەخشـێـت و بـنـاغـە تیۆرییەکەشی بۆ مەبەستی رێگەی بەرەو مـەبـەسـتـی داخـوازیـکـراو، دەگەڕێتەوە/ محێریق (١٩٩٦) ٣٣". لێکۆڵەرەوەکانی ئەم بوارە لـەسـەر پێناسەیەکی دیاریکراوی"میتۆد" کۆك نین، لەکاتێکدا کە رۆمێل پێیوایە کە"میتۆد کنە و پشکنینێکی وردە بە مەبەستی دۆزینەوەی زانیاری یـان پەیوەندیی تازە، "دالین" وایبۆدەچێ کە کۆششێکی وردە بە مەبـەسـتـی

دۆزینەوەی چارەسەری بۆ ئەو کێشەیانەی کە مرۆڤایەتییان بەخۆوە خەریککردووە و،"تۆد"یش پێیوایە کە بەپێی جۆر و بوار و ئامانج و شێوازەکانی توێژینەوە دەگۆڕێت/ بلحسن (٢٠١٠)". رەنگە بەرفراوانترین بۆچوون لەمبارەیەوە، بەگشتی، ئەوە بێت کە دەڵێ:"لە سەردەمی بووژانەوەی ئەوروپی" Renaissance"ەوە مەعنای وشەی میتۆد لەسەر ئەو کۆمەڵە ڕێسا گشتییە کەڵەکەکراوە بە مەبەستی گەیشتن بە راستی لە زانستدا بنیاتنراوە و مەعنای میتۆد بریتییەلەو ڕێگەیەی بەرەو دۆزینەوەی راستی لە زانستەکاندا دەڕوات بە گرتنەبەری کۆمەڵێك ڕێسای گشتیی ئەوتۆ کە باڵیان بەسەر ڕەوتی ئاوەز"عقل" کێشاوە و چالاکییەکانی دیاریدەکەن تا ئەو خاڵەی بگاتە دەرەنجامێکی زانراو/ بدوی،(١٩٧٧)٥".

بەم مەعنایە دەکرێ ئاماژە بۆ ئەو راستییە بکرێت کە بنەماکانی میتۆد، بەلایکەمەوە، لە دەقە فەلسەفییەکانی یۆناندا، لای"تالیس Thales ٦٢٥ – ٥٤٧پ. ز، ئەناکسیماندەر Anaximander ٦١١- ٥٤٧ پ. ز، ئەناکسیمانس Anaksimenes ٥٨٦ – ٥٢٦ پ. ز، پیتاگۆراس Pythagoras ٥٧٠ – ٤٩٠ پ. ز، هێراکلیتس Heraclitus ٥٣٥ – ٤٧٥ پ. ز، پارمەنیدیس Parmenides ٥١٥ – ٤٤٠ پ. ز، دیمۆکریتس Democritus ٤٦٠ – ٣٧٠ پ. ز، و فەیلەسوفە کۆنەکانیدیکەی یۆنان و بەتایبەتیش لای سوکرات Socrate ٤٧٠ - ٣٩٩ پ. ز، و پلەیتۆ ( Platonئەفلاتوون) ٤٢٨ – ٣٤٧ پ. ز بەدیدەکرێت و لای"ئەرستۆ Aristotle ٣٨٤ – ٣٢٢ پ. ز"ش، بەتایبەت لە بواری لۆجیك"مەنتیق"دا ئەو بنەمایانە زۆر

زەقترن وەکو پاشتریش دەردەکەوێ، هەر لەسەر بنەمای پرنسیپە رێکخەرەکانی پرۆسەی بیرکردنەوە و ئاوەز"عقل"ی ئەو مەنتیقە، کەسانی وەکو ئیمامی غەزالی (ابو حامد بن محمد ٤٥٠ – ٥٠٥ ك ١٠٥٨ – ١١١١ ز)و شەهرستانی (ابو الفتح تاج الدین عبدالکریم ٤٧٥ – ٥٤٨ ك ١٠٨٦ – ١١٤٣ ز)و ئیبن خەلدون (عبدالرحمن بن محمد ٧٣٢ – ٨٠٨ ك ١٣٣٢ – ١٤٠٦ ز)، لەنێو بیریارانی موسڵمان و "رۆجەر بەیکن – ١٢٩٢ – ١٢١٤ Roger Bacon ز"و"فرانسیس بەیکن – ١٦٢٦ – ١٥٦١ Francis Bacon ز"ی ئینگلیز، توانییان میتۆدی تایبەتی خۆیان دابرێژن و کارایی میتۆدەکانیشیان بسەلمێنن، بەتایبەت فرانسیس بەیکن کە بە دامەزرێنەری بنەماکانی"میتۆدی لۆژیکی زانستی"ناو دەبرێت. بەڵام تەنها لەلایەن فەیلەسوفی بەناوبانگی فەرەنسا"رینێ دیکارت – Rene Descartes ١٥٩٦ – ١٦٥٠ ز"ەوە رێك وشەی"میتۆد"، تەنانەت لە ناونیشانی کتێبیشدا[٢] بەکارهێنراوە و چۆنێتی پەیپێبردن و هەنگاوە پێویستەکانی خراونەتەروو، بۆیە ناوبراو بە دامەزرێنەری میتۆد ناودەبرێت. سەرهەڵدان و دۆزینەوەی میتۆد لەلایەن دیکارتەوە دەرەنجامی کارکردنیەتی، لە سەرەتاوە، لەسەر لۆژیك"لە بەشەکانی فەلسەفە و، شیکاریی ئەندازەیی و جەبر، لە بەشەکانی بیرکاری. لەبارەی ئەم بوارانەشەوە دەڵێ"سێ هونەر یان زانستی کە پێم وا بوو دەبێ کۆمەکێکم بکەن لە پرۆژەکەمدا / دیکارت، (١٩٣٠)، ٢٦". بەڵام وەکو پاشتر دەردەکەوێ ئەرکی شیکاری دەبێتە کاری بناغەیی ئەم فەیلەسوفە و، خەسڵەتی بەرجەستەی شیکاریی دیکارتییانە،"هەمان ئەو – خەسڵەتەیە – کە لایپنتز" Gottfried

Wilhelm Leibniz ١٦٤٦ – ١٧١٦ ز"لە زانستی گەوهەری تاك – مۆنادۆلۆژی – دا بەم گوتەیە رایگەیاند"هەر کاتێك راستییەك پێویست بێت، ئەوا مرۆڤ دەتوانێ، لە رێگەی شیکردنەوەوە، پاساوەکەی بدۆزێتەوە، ئەویشبە شیکردنەوەی بۆ بۆچوون و راستیی ئاسانتر تا ئەوەی بگاتە راستییە سەرەتاییەکان، الخضيری (١٩٣٠)، ٢٦". خوێنەری ئەو کتێبە دەتوانێ دڵنیا بێت لەوەی، پاش شەن و کەو کردنی هەموو لایەنێك، دیکارت پتر سوودی لە"لۆژیك"وەرگرتووە و، ئەو پرنسیپانەش کە دایڕشتوون لەسەر بناغەی هەمان بوار بووە و، پرنسیپەکانیش ئەمانەن:

١. رێسای دڵنیابوون: واتە قایلنەبوون بە هەر شتێك بەوەی راستییە پێش دڵنیابوونی تەواو لەو مەسەلەیە و، خۆدوورخستنەوە لە هەڵەشەیی لەو بوارەدا.

٢. رێسای شیکردنەوە: دابەشکردنی هەر یەکێك لەو کێشەیانەیانەی تاقیدەکرێنەوە بۆ چەندین بەشی ئەوتۆ کە چیدی دابەشناکرێن بۆ چارەسەرکردنیان بە جوانترین شێوە.

٣. رێسای پێکهێنان: پیادەکردنی شێوازی بەرەو پێشەوەبردنی بۆچوونەکان، لە ئاسانترین و زانراوترینیانەوە بۆ ئاڵۆزترینیان.

٤. رێسای سەرلەبەر پێداچوونەوە: هەڵسان بە ئامارکاری و پێداچوونەوەی سەرلەبەری هەنگاوەکان، لە هەموو هەلومەرجێکدا بۆ دڵنیابوون لە فەرامۆشنەکردنی هیچ خاڵێك"دیکارت (١٩٣٠)، ٣٢ - ٢٩.

ئەوەی بەلای دیکارتەوە لە میتۆدەکەیدا رەزامەندیبەخشبوو توانای بەکارهێنانی ئاوەز بوو لە هەرشتێکدا با ئەو بەکارهێنانەش سنووردار بێت و "لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، لەپیادەکردنی ئەو میتۆدەدا، هەستم بەوە دەکرد کە ئاوەز "عقل"م وردەوردە لەسەر ئەوە رادەهات کە بە شێوەیەکی گەلێك روونتر و بە توانای جیاوازترەوە وێنای ئەو شتانە بکات کە وێنایدەکردن، دیکارت (١٩٣٠)، ٣٦".

گرنگترین خاڵ لە لێکۆڵینەوەی راستەقینە و پشت بە میتۆد بەستوودا پرسیارە یان وردتر: چۆنێتیی پرسیارکردن. بێگومان جۆری پرسیاریش رۆڵێکی گەورە و یەکلاکەرەوە لە دیاریکردنی شێوازی گەڕان بە دووی وەڵامدا دەبینێت. ئەرستۆ لە ئاوڕدانەوەیەکی ورد و زیرەکانەدا ئەوەی دووپاتکردووەتەوە کە "ئەوەی دەیانەوێ بگەنە راستی دەبێ پێش هەموو شتێك پرسیاری راستودروست بکەن، حسن (١٩٩٦)، ٢٦". بەڵام پرسیار خۆی دەرەنجامی تێبینییە و بە بوونی پرسیاری باش، تێبینی، گریمانە"Hypothesis"ی سەرکەوتوو، شێوازی گونجاوی شیکردنەوە، شێوازی گونجاوی پێوانەی لۆژیکی"Syllogism"، راڤە و پۆلێنکردنی ورد و دروستی راستییەکان و خستنەڕوو و یان بە شێوەیەکی ورد و دروست، بەکارهێنانی خەیاڵی داهێنەرانە و هەڵسەنگاندنی خود لە هەموو هەنگاوەکاندا و خۆشلنەکردن بۆ راستییەکان بەبێ تاقیکردنەوە و شەنوکەوکردنیان، بە بوونی تێکڕای ئەم هەنگاوانە دەکرێ باس لە هەلومەرجە بناغەییەکانی بوونی "گیانی زانستی" بکرێت، بەوپێیەی "مانای خودی زانست، لە بناغەوە، گیانی زانستیی بەخۆوەگرتووە، Shera ١٩٦٥ , ١٦٢". چەمکی "گیانی زانستی"ش بەندە بە

رەفتاری خودی مرۆڤەوە و زادەی "حەزكردن لە ئاگاداربوون، سەرسامی، خاوێنی، ئارامبوون لەسەر تێبینیكردن، خۆنەویستی، ئازایەتی، لە مەترسی نەترسان و دەستپاكی لەگەڵ خود و رووداوەكانە، محێریق(١٩٩٦، ٣٥". پرنسیپە گرنگەكانی ئەو گیانەش بریتینلە"هۆبینی – السببیة"، حەتمییەت و"ئەگەربینی – الاحتمالیة".

لە پیادەكردنی میتۆددا بوونی گریمانە"Hypothess" نەك تەنها یەكەمین هەنگاوی زۆر گرنگە بەڵكو داینەمۆی بەرەو پێشەوەبردنی كۆششی ئەو پیادەكردنەشە. گریمانە خۆی دەرەنجامی مامەڵەی جیدییە لەگەڵ بابەتێكی دیاریكراو بەو ئاراستەی رەهەندی تازەی تێدابدۆزرێتەوە، یان بەلایكەمەوە دیدێكی جیاوازی رەهەندێكی پێشتر دیاریكراو بخرێتەڕوو. بۆئەوەی ئەو گریمانەیە دروستبكرێت –پێكبهێنرێت–، پێویستە"توێژەرەوە توانای پێكەوەگرێدانی فاكتەكانی هەبێت و ئەزموونەكەش بە چاوێكی كراوە بپشكنێت و هەموو توانای بیركردنەوەی ئاراستەی لایەنێكی دیاریكراو نەكات و لایەنەكانیدیكە پشتگوێبخات، حسن (١٩٩٦)، ٢٧". بەگشتی، گریمانەی باش كۆكەرەوەی كۆمەڵە خەسڵەتێكە، لەوانە: لە رێگەی بەكارهێنانی لۆژیكی دروستەوە، لەنێوان كۆمەڵێك راستیدا، كۆدەكرێتەوە و راڤەدەكرێت و پێكدەهێنرێت، دەتوانرێ بخرێتە ژێر تاقیكردنەوەوە بۆ سەلماندنی یان رەتكردنەوەی، لەگەڵ بنەما و راستییە نەگۆڕەكانی بواری لێكۆڵینەوەدا تەبایە و لەنێوان سەرجەم هاوشێوەكانی، دەبێ روون و ئاسانتربێت، حسن (١٩٩٦)، ٢٨".

## سۆفیگەری و میتۆد

میتۆد پشت بە لۆژیك دەبەستێت، واتە ئاوەز "عقل" رێکخەرێتی و سۆفیگەریش هیچ متمانەیەکی بە ئاوەز نییە و لە بواری ئەپستمۆلـۆژی "معرفی"ی ئەزموونی سۆفیگەریدا کە خواناسییە، بە"دەستـەپـاچـە" و "کلۆڵ"و چەند سیفەتێکی هاوشێوەیدیکە ناودەبرێت. کەواتە چۆن بـاس لە بوونی "میتۆد" لای شاعیرێکی وەکو "مەحوی" دەکرێت کە گـومـان لە "سۆفی بوون"ی ناکرێت!؟ بەلاّم بۆئەوەی ئەو سەرەتایەی هێنرایەوە – واتە دژایەتیی سۆفیگەری لەگەڵ لۆژیك و ئاوەز – نەبێتە حـوکـمـێـکـی بێبنەما پێویستە، بەلای کەمەوە ئاماژە بـۆ بـۆچـوونـی یـەك، دوو فەیلەسوفی لایەنگری مەنتیق بکرێت. بێرترانـد راسـل ( Bertrand russel ١٨٧٢ - ١٩٧٠)و (والتـەر سـتـەیـس Walter T. Stace ١٨٨٦ - ١٩٦٧) دوو فەیلەسوفی ناسراوی سەدەی رابوردوون. یەکەمیان بەوە ناسراوە کە پشتیوانێکی گەورەی "ئاوەز"و بنەمـاکـانـی تاقیکردنەوەی زانستییە و دانەری کتێبی "بنەماکانی بیرکـاری"یـە کـە وەکو لە پێشەکیی یەکەمین بەرگیدا –چاپی دووەم– هـاتـووە کـە بـە لێکۆڵینەوە و بلاّوکردنەوەی " خەسڵەتی لۆژیکی ریازی گەلێـك چـاکـتر بووەوە، راسل (١٩٥٨)، ٥"، دووەمیشیان، جگـەلـەوەی بـاشـتریـن و ناســـــراوترین راڤەکاری فــــەلسەفـەی هـیــــــگـل ( Hegel , Georg Wilhelm Fridrich ١٧٧٠ – ١٨٣١)ە، یەکێکە لـەو فەیلەسسوفانەی سەرەڕای قووڵیی فەلسەفەکەیان، ئاسان بەکاردەهێنن بـۆ گەیاندنی بۆچوونەکانیان.

بەلای "راسل"ەوە ئەو خەڵکانەی سەروکاریان لەگەڵ فەلسەفە هەیە پتر لایەنگری یەکێك لە دوو ئاراستەی دژ بە یەك بوون: یەکەمیان پتر بەلای بواری زانستدا شکاوەتەوە، وەکو هیوم (David Hume ١٧١١ - ١٧٧٦)، کەچی کەسێکی وەکو ولیەم بلەیك ( William Blake ١٧٥٧ - ١٨٢٧)ی شاعیر و وێنەکێشی ناسراوی ئینگلیز دوژمنایەتییەکی گەورەی لەگەڵ زانست و دیدێکی سۆفیگەرانەی قووڵی هەبووە. راسل لەنێوان ئەم دوو کۆمەڵەشدا کۆمەڵێکیدیکە دەستنیشاندەکات و دەڵێ: "بەلاّم گەورەترین ئەو پیاوانەی بە فەلسەفەوە خەریکبوون، هەم هەستیان بە پێویستیی زانست و هەم بە پێویستیی سۆفیگەریش کردووە، راسل (١٣٦٢ کۆچی هەتاوی)، ٣٧". وێرای ئەم تێبینییە وردەی کە لە بەرژەوەندییی سۆفیگەریدایە، راسل زۆر بە روونی لەبارەی سۆفییانی زۆر گەورەوە، بەتایبەت ئەوانەی کە رۆژهەلاّتین، دەڵێ: "لۆژیك بەکارناهێنن، بەڵکو دەرەنجامی ئەزموون و سلووکی خۆیان راستەوخۆ دەردەبڕن، راسل (هـ. س)، ٦١". ستەیس، لە دەسپێکی راستەقینەی کتێبەکەیەوە باس لە ئەزموونی سۆفیگەری دەکات و دەڵێ: "لەو راستییە سایکۆلۆژییەوە دەستپێدەکەین کە ئەگەر لە رووی نەزانییەوە نەبێ، ناتوانرێ رەتبکرێتەوە، ئەویش رووبەڕووبوونەوەی جاربەجاری هێندێك مرۆڤە لەگەڵ ئەزموونگەلی نائاسایی کە ناوی تایبەت و جیاوازی" ئەزموونی سۆفیگەری" لێدەنرێ، ستەیس (١٩٩٩)، ٢٢". ئەم فەیلەسوفە لە کتێبەکەیدا دەیان نموونەی دابڕانی ئەزموونی سۆفیگەری لە زەمینەی واقیعی دەهێنێتەوە و، بە کێشەی گەورەی بەردەم لێکۆڵینەوەی ئەو بوارەیان دەزانێت، لەوانە:"ئاستەنگێك هەیە

بریتییە لەوەی سۆفییەکان، بە شێوەیەکی ئاسایی، دەڵێن ئەزموونەکەیان ناتوانرێ باسبکرێت و بۆ خەڵکانیدیکە بگوازرێتەوە –روونبکرێتەوە–، چونکە لە سەرووی وەسفەوەیە، ستەیس (١٩٩٩)، ٧٨" بەم جەخت لەسەر کردنەش رێکەوتنی هەردوولا – سۆفییان و فەیلەسوفەکان – لەسەر ناتەبایی جیهانی تایبەتی ئەزموونی سۆفیگەری و لۆژیکی ئاوەز روونده‌بێتەوە، کەواتە باس لە چ میتۆدێك دەکرێت!؟.

خودی ئەو دوو فەیلەسوفە، هەریەکەیان، کلیلێکی کردنەوەی ئەم رازەمان دەداتێ. راسل لە کتێبی "بنەماکانی ماتماتیك"دا دەڵێ :"مەبەستی لۆژیك سەربەخۆبوونە لە جیهانی ئەزموون "الواقع التجريبي"و بوونی گەردوونیش ئەوانە دوو میتۆدی جیاوازیان هەیە، ئایا ناکرێ لە دەرەوەی ئەو دوو میتۆدە میتۆدیدیکە هەبێت و لەلایەن یاسا و رێسا تایبەتەکانی خۆیەوە هەنگاوەکانی دیاریبکرێت!؟. پێدەچێ جەختکردنی "راسل" لەسەر ئەوەی پیاوە گەورەکانی فەلسەفە هەم زانستخوازییان تێدابووە و هەم دیدی سۆفیگەرانە، لەلایەکەوە دداننانبێت بەوەی ئەو میتۆدە دەکرێ هەبێت و هەم راگەیاندنی ئەوەش بێت کە دەکرێ، سەرەڕای دژەئاراستەیی زانست و سۆفیگەری لە ناخی فەیلەسوفدا گۆڕەپانی ئاشتکردنەوەشیان هەبێت.

ستەیس پێی باش نییە تێگەیشتنی کۆتایی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەزموونی سۆفیگەری و دەقەکانی، بە "ئەنجامگیری" ناوببات و لەبری ئەوە وشەی "مانا کردن – التأويل" پێشنیازدەکات "ستیس (١٩٩٩) ،٣٠"، ئەمەش هەم دداننان و هەم رێزگرتنی تایبەتمەندیی ئەو ئەزموونە و زاراوەکان و زمانی جیاوازیەتی و لە پاساوە تایبەتەکانی سۆفییانیشەوە ئەو

لێچواندنەی ئەو کوێرە دەهێنێتەوە کە هەرچەندە باسی رەنگی لا بکرێت ناتوانێ وێنا –تصور– ی بکات و " ئاوەهاش سۆفی ناتوانێ ئەزموونەکەی خۆی بۆ کەس باسبکات، ستەیس (١٩٩٩)،٣٤"، هەروەها کە ئاوڕ لە شکانەوەی (ولیەم جێمس William James ١٨٤٢ – ١٩١٠)ی فەیلەسوفی پراگماتیی ناسراوی ئەمریکا بەلای سۆفیگەریدا دەداتەوە ئەو پاساوەی ناوبراو دەهێنێتەوە کە" هاوسۆزیی فەیلەسوفی ناسۆفی لەگەڵ سۆفیگەری رەنگە رادەیەکی ئەوتۆی چاوساغی "البصیرە"ی[٣] پێببەخشێت کە بتوانێ دزەبکاتە نێو حاڵەتی زەینی سۆفیگەرانەوە، ستەیس (١٩٩٩)، ٣٦"، ئەم لێوەرگرتنەی "ستەیس" بەڵگەی ئەوەیە کە سۆفیگەری، وێڕای ئەوەی بوارێکی جیاوازە و شێوازێکی بەتەواوی جیاواز لە میتۆدی ئاوەزگەرا (عقلی- Rationalist)و ئەزموونگەرا (تجریبی- Emprisist)ەکانەوە، بە هۆی دەرەنجامە کردەکییەکانیەوە کە ناتوانرێ پشتگوێبخرێن و رەتبکرێنەوە، پێویستە وەکو دیفاکتۆش بێت، پەسەندبکرێت و رێزی لێبنرێت و هەوڵبدرێت لێیتێبگەن.

بەلاّم، وێڕای هەموو شتێك، خەڵکانی موسڵمان و عەرەب و پسپۆڕی بواری سۆفیگەری/ش، لەوانەی شارەزایی باشیان لە میتۆد هەیە، وەکو دوکتۆر یوسف زیدان بۆ نموونە و هەموو ئەوانەی بەکردەوە هەم ئەزموونی سۆفیگەرییان هەیە و هەم شارەزای لۆژیك و میتۆدن، سووردەزانن کە سۆفیگەری بەکردەوە "دژە میتۆد- Against Method"ە, بۆ پتر روونکردنەوەی ئەمەش دەکرێ باس لە هەردوو چەمکی "الجذب – جەزبە"و "چەژ"ی سۆفیگەرانە بکرێن کە رۆڵی گرنگ لەو ئەزموونەدا دەبینن و دژەمیتۆدن، زیدان (١٩٩٦)، ١٢".

## ئایا"دژە میتۆد"بوون خەسڵەتێکی نەگێتڤانە – سلبی– یە!؟.

بەشێکی بەرچاوی گەورە پیاوانی فەلسەفەی زانست لە سەدەی رابوردوودا، لەوانەی سەر بە ئاراستەی "پۆزێتیزمی لۆژیکی-Logical Positivism"بوون، بەتایبەت هی گرووپی ڤیەننا، وەکو رۆدۆڵف کارناپ (Rudolf Carnap، ١٨٢١ - ١٩٧٠)و ڤیتگینشتاین (Ludwig Wittgenstein، ١٨٨٩ - ١٩٥١)، بەڵکو هەموو ئەزموونگەرایانیش، میتافیزیکیان رەتدەکردەوە، چ جای ئەوەی باس لە سۆفیگەری بکرێت. ئەم ئاراستەیە هێندە زیادەڕۆییان لە زانستدا کرد کە باسیان لە یەکێتیی زانست بەوپێیە کرد کە یاسای تیۆرییەکی دیاریکراو دەتوانرێ بگێڕدرێتەوە بۆ تیۆرییەکیدیکە و بێپایانیی زانست بەوپێیەی هیچ پرسیارێك نییە زانست نەتوانێ، لە رووی مەبدەئەوە، وەڵامی نەداتەوە، سەرکەوتنی گەورەی زانست لە پێشبینی، راڤەکردن و کۆنترۆڵ کردن، میتۆدی زانستی سەربەخۆیی بۆ ئەنجامگیرییەکانی زانایان دابیندەکات و زانستیش هەمیشە لە بەرژەوەندیی مرۆڤدا بووە. ئەم زێدەڕۆییە لە نیوەی دووەمی سەدەی رابوردووەوە خرانەبەر رۆشنایی پرسیارەوە و ئارستەیەکی تازەی فەلسەفەی پشتئەستوور بە دەرەنجامەکانی مێژووی زانست ئەو بۆچوونانەی خستەبەر رۆشنایی رەخنەوە و پاوڵ فییرابێند (PaulFeyerabend)ی فەیلەسوفی نەمساویی خاوەن کتێبی "دژە میتۆد- Against Method) رایگەیاند کە :"ئەنارشیزمی[٤] سیاسی مەرج نییە سیاسەتی نموونەیی باشبێت بۆ کۆمەڵی مرۆڤایەتی،

بەلاّم "میتۆدۆلۆژیی ئەنارشیست – Anarchistic Methodology)و دەرەنجامەکەی کە "زانستی ئەنارشیت – Anarchistic Science)ە پێکەوە نوێنەری ئەپستمۆلۆژی "تیۆریی زانست - Epistemology)ی نموونەیین، ابو النور (١٩٩٦)، ١٩٠". لە چوارچێوەی ئەم "میتۆدۆلۆژییە ئەنارشیست"ەدا فییرباند رایدەگەیەنێ کە دەتوانرێ گەندەڵیی سەرجەمی رێسا مەنهەجییە باوەکان بخرێتەڕوو، بۆیە پێویستە هەمیشە میتۆدی رکابەر رەچاوبکرێت و "تاکسەرچاوەیی دەسەلاّت لە بەرژەوەندیی خودی زانستدا نییە، هـ. س، ١٩٢.

فییرابێند و هاوڕێیانی، وەکو تۆماس کۆن (Thomas Kuhn ١٩٢٢ – ١٩٩٦)و ئەوانیدیکەش، بناغەی فەلسەفیی پتەوی دیاردەی نەگونجاویی ریشەیی (Incommensurability)ی نێوان تیۆرییە گەورەکانی زانست دەخەنەڕوو، هـ. س، ١٩٨"و لە رووی سیاسیشەوە فییربێند ئەو زەنگی مەترسییە لێدەدات کە زانست "لە پتر لە یەك قۆناغدا خەریکبووە شوێنی ئایین بگرێتەوە و رۆڵی خۆی بگێرێت لە پاساوهێنانەوە بۆ دەسەلاّت و پاراستنی یەکسەرچاوەیی دەسەلاّت، هـ. س، ٢٠٢"، لە ئەنجامی ئەمەشدا داوای ئەوە دەکات کە زانست و دەوڵەت لێکجیابکرێنەوە بە هەمان ئەو شێوەیەی ئایین و دەوڵەت لێکجیابکرێنەوە. ئەم بۆچوونەی فییربێند و هاوەلاّنی بەو مەعنایە نییە کە میتۆدی زانستیی ئاوەزگەرا و ئەزموونگەراکان بەتەواوی رەتبکرێنەوە، بەڵکو بەو مەعنایەیە کە بوار بڕەخسێنرێ بۆ چەندین جۆرە میتۆد بە میتۆدی ئەفسانە و"تیۆریی ئافەریدەکردن"ی سەرەتاییشەوە کە

بێگومان میتۆدی سۆفیگەرانەش جێیشیاوی خۆی لەو چوارچێوەیەدا بە شایستەیی دەکاتەوە. بەکورتی، بانگی گەورە بانگەشەکارانی ئەم "دژەمیتۆد" وریاکردنەوەی زانستخوازانە لەوەی بوار بە "دیکتاتۆرییەتی تاك– میتۆدی" بدرێت.

پسپۆڕانی میتۆد، لەوانەی لە بوارەکانی بیری ئیسلامیدا کاردەکەن، وێڕای دڵنیاییان لەوەی بیری ئایینی لە چوارچێوەی میتۆدی ئەزموونگەرا و ئاوەزگەرایانی سەدەی رابوردوودا جێیناکرێتەوە، چونکە تێکڕای بوارەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکانیش کێشەیان لەگەڵ ئەو میتۆدە هەیە، خۆشیان تێبینیی راستەوخۆیان لەبارەی میتۆدی زانستییەوە هەیە. "الفضلي"، پاش هێنانەوەی بۆچوونی هێندێك لە بیریارانی بیانیی میتۆد، وەکو "ڤان دالین"، "پۆڵەنیسکی" و"ویتنی"، ئاماژە بۆ ئەو راستییە دەکات کە لەو پێناسانەی ئەواندا میتۆدە عەقڵی و نەقڵییە کۆنەکان رەتکراونەتەوە و " لەبەرئەوەی ئەو میتۆدانە تائێستا لە فەرهەنگی ئیسلامیماندا وەکو میتۆدی رەسەن بەکاردەهێنرێن، ناتوانین پشت بە هیچ یەکێك لەو پێناسانە ببەستین، الفضلي (١٩٩٢)، ١٢"، بۆیە پێشنیازی ئەم پێناسەیە بۆ وشەی "توێژینەوە – البحث" پێشنیازدەکات کە لەگەڵ میتۆدە ئیسلامییەکان دەگونجێ :"بەکارهێنانی شێوازە زانستییەکانە، بە بیروبۆچوون و ئامرازەوە، بەپێی رێساکانی میتۆد، بۆ زانینی گریمانەیەك، هـ. س، ١٣". ناوبراو لە میتۆدی وەدەستهێنانی زانیاری لە ئیسلامدا وشەی "وحی– سرووش– Revelation"و "إلهام – بەخشش –Inspiration"بەکاردەهێنێ و لەبارەی "وحی"یەوە ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە :"پێغەمبەران

ئامادەسازییەکی تایبەتیان بۆ ئەم پەیوەندییە تێدایە و، وەلی و عارف – سۆفی –یەکانیش پلەی نزمتریان تێدایە کە پێیدەگوترێ ئیلهـام، هـ. س، ٣١". بە ئاماژە بۆ ئایەتی پیرۆزی: (فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا/ الشـمـس ٨"،"الراغب الاسفهانی" لەبارەی وشەی "الالهام"ەوە دەڵێ: "هەڵـدانـی شت بۆ نێو ناخ و، ئەمەش تایبەتە بەوەی بەوی لەلایەن خـواوە بـێـت، الاسفهانی (١٤١٦ ك)، ٧٤٨". بەمەش نووسەر پەنجەیەك دەخـاتـەسـەر میتۆدی سۆفییان کە زانیارییەکەی لەلایەن خـواوەیـە "لـدُنّـی"یـە و، ئەمەش گەورە سۆفییان جەختیان لەسەر کردووە.

"العلوانی"بیریارێکیدیکەی ناسراوە لە جیهانی ئیسلامـیـدا، لـە گۆشەیەکی زۆر گرنگەوە تایبەتمەندییەکانی میتۆدی ئیسلامی دەخاتەڕوو کە بە"چوار رێساکەی خاوێنـکـردنـەوە – قـواعـد الـتـزکـیـة الاربـع" ناویاندەبات و بریتینلە: "یەکتاگەرایی–التوحید–، یەکێتیی مرۆڤـ لـە بناغە و سەرچاوەی بوون ئەرکی ئاوەدانی و چارەنووس، یەکتایی رەوایـی و تەنهایی خوا لە زانینی تەواوی راستی و رەوایی و بـڕواهـێـنـان بـە جێنشینیی مرۆڤـ لەسەر زەوی و بەوەی متمانەی پێکراوە لـە هـەمـوو گەردووندا، بۆیە بۆی نییە لەو ئەرکە ئاوەدانییەی "هیچ شتێك بە فـێـڕۆ بدات و، هیچ شتێك لەم گەردوونەدا تێکبدات کە متمانەی تێدا پێکراوە، العلوانی (١٤١٧ ك)، ١٢"و، ئەوانەش بە "رێساکانی میتۆدی گۆڕیـنـی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا، هـ. س، ٢٣"ناودەبات. لـە روانـگـەی ئـەو میتۆدەشەوە، "العلوانی" بەوردی دیاردەی روونی "فرە – ناسنامـە"یـی ئەتنیکی لە جیهانی ئیسلامیدا شیدەکاتەوە و ئەرکی ئەو مرۆڤە داهێنەر و بنیاتنەر و خاوەن پەیامی "گۆڕین"ەش لە ئاستی ئەو دیاردە ئـاڵـۆزە

دەخاتەڕوو. نووسەر هەموو شێوازێك بۆ مرۆڤ، لەپێناوی ئەو مەبەستەدا، بە مەرجێك پشت بە میتۆدگەرایی مەعریفیی قورئانی و پەنابردنەبەر "وەحی – سرووش"و شێوازەکانی بیرکردنەوە لە گەردوون ببەستێت، بە شێوازی کارا دەزانێت و، ئەگەر ئەوەشی پێنەکرا، ئەوا هێندەی بەسە کە دڵنیابێت لە راست و ڕەوایی ئەوەی دەیکات و، دڵی بەو ئەرکەی ئاسوودەبێت. ئەم بۆچوونانەش، ئەگەرچی ناوی سۆفیگەریی تێدانەبراوە، بەڵام پێوەرەکان –رێساکان–ی خاوێنکردنەوە و ئاماژەکردن بۆ ئەمانەت و متمانەی گەردوونیی، ئەگەر بە مەبەستیش نەبووبێ، کۆمەڵێك بنەمای بنچینەیی میتۆدی سۆفیگەری دەگرێتەخۆ.

❊❊

## مەحوی و میتۆد

لە شیعری "مەحوی"دا هەم راستەوخۆ باس لە میتۆد کراوە و، بۆ ئەو مەبەستە، هەم وشەی "مەنهەج" بەکار هێنراوە و هەم ناوی ئەو "مەنهەج"ەش دیاریکراوە:

من لە یەکدا یەك دەبینم، چل لە دوودا، دەه لە سێ
<u>مەنهەجی عیشقی حەقیقی</u> (نوون)ە، پەنجای جێبەجێ [٥]

دیوانی مەحوی، پاشبەند، بەسەرداهاتنەوەیەك، - ٤ – ل ٥٤٦

بەمەش دەکرێ دڵنیابین لەوەی فەرهەنگی بناغەیی مەحوی فەرهەنگی ناسین و جیاکردنەوەی تێرم (زاراوەکان)و بەکارهێنانیانە لە شوێنی شیاوی خۆیاندا. "موعەمما"بوونی ئەو بەیتە لە بایەخ و ئاراستەی بەکارهێنانی ئەو وشەیە، وەکو زاراوە، لەو بەیتەدا کەمناکاتەوە، چونکە لە سەرتاسەری دیوانی شاعیردا رووبەڕووی چەندین بەیتیدیکە دەبینەوە کە وشەیدیکەی بە مەعنا و مەبەستی "مەنهەج"یان تێدابەکارهێنراوە و، وێڕای ئەوەش، هەست بەوە ناکرێت کە لە بایەخی هونەریی بەرزی کەمبووبێتەوە. هەردوو وشەی "منهاج" کە لە قورئانی پیرۆز و، "منهج"یش کە لە فەرموودەی پێغەمبەر (س)دا بەکارهێنراون – بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١) ئەم بابەتە – لە رووی زمانەوانییەوە لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا هەر مەعنای "رێ – رێگە" دەبەخشن، لسان العرب ٢ / ٣٨٢، العين ٣ / ٣٩٢، المعجم الوسيط ٢ / ٩٥٧،

أساس البلاغة ١ / ٦٥٩، تهذيب اللغة ٦ / ٤١، معجم مقاييس اللغة ٥ / ٣٦١ "، لە رووی زاراوەییشەوە ئەزموونی سۆفیگەری خۆی "مەنهەج"ی سۆفییە و، لەبەرئەوەی ئەو ئەزموونە چەندین رێباز "تەریقەت"ی جۆربەجۆری هەیە و هەر یەکێك لەو تەریقەتانەش تایبەتمەندیی خۆی هەیە، بۆیە چەندین مەنهەجی گەیشتن هەیە، بۆیە"ئەوەی خوای گەورە پلەکانی ناو و سیفەتەکانی لە هەموو پلەکانی خود "الذات"دا پیشاندا ئەوا نزیکترین رێگەی یەکەمین مەنهەجی پیشانداوە کە لەنێو مەنهەجەکانی رێگە –رێباز–دا مەنهەجی ئەو کەسەیە کە بە ناوە خوداییەکان دڵنیایی بۆ وەدەستهاتووە. سۆفیش چەندین مەنهەجی هەیە کە مورید و سالك دەیگرنەبەر و، بەپێی پلەکانی بەرزبوونەوە لە تەریقەتدا پۆلێندەکرێن، الحفنی (٢٠٠٦)،١٢٨٧". واتە میتۆد، لە سۆفیگەریدا، رێبازە کردەکی "عملی"یەکەیە –ئەزموونەکە– و، ئەمەش یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی لە هەموو رێبازەکانی ئەم بوارەدا هاوبەشە. ئەم خاڵانە چۆن لە شیعری"مەحوی"دا رەگیانداوەتەوە؟

شوێنپێ هەڵگرتنی شیعری "مەحوی" ئەوەمان بۆ روون‌دەکاتەوە کە وشەکانی "رێ، رێگە – بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی – و هەموو پاشبەندەکانی" و"مەنزڵ"، "کۆ"، "مەلجە ئ"، "مەئوا"، "مەیکەدە"و هەموو وشە هاوشێوەکانیدیکە و، "دەر"، "باب"و، "رەهرەو"و.. تاد، بەکارهێنراون کە سەرجەمیان نیشانەی گرنگیی ئەو چەمکە و چەمکە پێوەبەستراوەکانن. نموونە سەرەتاییەکانی ئاماژەی راستەوخۆ بۆ وشەی "رێ – رێگە" دەتوانن سەرەدەزوویەکمان بخەنەبەردەست:

تا نەبووری تۆ لە سـەر، رێ ناخەیـە مەیـدانی عیشـــق
سەر لە پێشی پێ  دەبێ لەم رێگـــە دانێـــــی (أوّلا)

**١٠ أ ٥، ٢٩**

تاقـــــە خانێکـە لەســـەر رێی ئاخیــــرەت
زادی رێ هەڵناگــــری لەم خانــــە بـــۆچ !؟

**١ چ ٧، ٩٧**

رووتی دی، لــــــەو رۆژەوە، گــەر رۆژە سـەرگەردانە رۆژ
گەییـــە ئێـــوارە، وەکو من، ئیشـــی قورپێوانـــە رۆژ
رەهـــــڕەوی رێگـەی مەحەببـەت وا دەبێ هەر سـەعیـەتی
تا هەیـــــە لەم رێگـــــە ئاخر کاری ســــەردانانـە رۆژ
لاجــەرەم کردوویــەنووری جیلوەی  ئەو ماهـــــە بە چاو
دەوری بۆ ئــــــەو شــــــەمعەیە دایـم وەکو پەروانــە رۆژ

**١ ژ ١ تا ٣، ١٣٧**

گـەر عازیمی زیارەتی  کەعبــــەی مەحەببــەتی
رێ: چاکـی دڵ، عـەلامەتی رێ: داغ و شوێنی داغ

**١ غ ٢، ١٧١**

دەگەییــــە مەنزڵی سـەلما بــە ســــەد قــــەرن
بە گامێ طی بکـەی  گــەر ســەد دە فرســەنگ

**١ گ ٤، ١٩٨**

ڕێگـەی هودا طـە ریقـەتی عیشقە، دە"مەحویا"
وەرن و پیـــابڕۆن و (و صلّـــوا علی الرســـول)
هەر ئە طە ریقـە بـوو بە هەموو سەحبی گرتیـان
ڕۆیین پیـــا، هەتا گەینــــە مەرتەبـــەی وسوول

**٣ م ٨ و ٩، ٢٠٨**

دیارم دەیـری عیشـــقە، جێ بە ســـووتن بێ لەوێ دەگـــرم
کە من مشتێ چڵ و چێوم، بە چی بم، کەڵکی کێ دەگرم !؟
نەگەییە دامەنی دەســــتی دوعا، جا دەبمە خاکـــی ڕێـــی
طە ریقـــەی گۆشــــەگیری بەردەدەم، ئەمجـــارە ڕێ دەگـــرم

**٤ م ١ و ٢، ٢١٧ و ٢١٨**

گلــــەی پێ / شـــم لەســـەر ســـەر هـــەم بووە بـار
کـە دی من دولبــــەرم هات و بە ســـــــەر چـــووم
دەزانــــم بادیــــەی عیشـــــــقە خەگـــــەرناك
کەچـی هـــــەر چـــووم، ئەگەر مام و ئەگـــەر چـــووم

**٧ م ٤ و ٥، ٢٢٥**

بلاّ نەیشـیگەمێ، هەر بۆ سەر سەرئەفرازی، بە سەر نەك پێ
بە ڕێگـــەی یاردا (لاُبدّ منـــــە)ە دوو بـــە دوو ڕۆییـــــن

**٧ ن ٤، ٢٥١**

لە ڕێگــەی مەهلەکـەی عیشـــق ئەر بەڵاجوو نی، برا، لادە
ئــەوی من چــووم و لەوما دی هـــەر ئاە و داد و فـەریادە

**٣ ه ٤، ٢٦٨**

کێوی غـــەم، وادیی جەفـا گـەی کردنە ئەشـراگی عیشـق
باکی هەوراز و نشـێوت کەی دەبێ گـــەر ڕەهـــڕەوی

**١٢ ی ٢، ٣١٧**

گوم کە بوو ڕاهی هـودا، شـاهڕەهە گومڕاهـــی
(بعـد درویشـی اگـــر هیچ نباشـد شـــاهی)

**١٣ ی ١، ٣١٩**

هێنانەوەی ئەم چەند بەیتە لە ژمارەیەکی ئێجگار گـەورەی ئـەو بەیتانەی شیعری "مەحوی" کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ وشەی "ڕێ – ڕێگە"و هاومەبەستەکانیان تێدابەکارهێنراوە بۆ سەلماندنی ئـەوەیـە کـە شاعیر وریایانە و بۆ مەبەستی دیاریکراوی خۆی بـەکـاریـهـێـنـاون. لـە یەکەمین نموونەدا "تا نەبووری تۆ لە سـەر ڕێ ناخەیە مەیدانی عیشق"، ئەوەی بە ڕوونی ڕاگەیاندووە کە بواری مەبەست بواری عیشـقـە و، بـۆ ئەوەی مرۆڤــ بتوانێ بچێتە نێو پەرژینی قەدەغـە – پـاوان –ی ئـەو بوارەوە دەبێ پێشتر بڕیاریدابێت خۆی بەختبکات – خۆی بـفـەوتـێـنـێ، فەنابێت – و، ئەمەش مەرجی سەرەکیی ڕێبازی عیـشـق و هـەمـوو ئەزموونی سۆفیگەرییە و پێوەری گەیشتنیشە.

لە راستیشدا دەکرێ ئەو "فەوتان"ە "سەر لە پێشی پێ دەبێ لەم رێگە دانێی (أوّلا)"، بەپێی پلە جۆربەجۆرەکانی سالیك لە ئەزموونی سۆفیگەریدا، بە چەندین جۆر لێکبدرێتەوە. لە روویەکەوە بناغەی مامەڵە لەم ئەزموونەدا خۆشەویستیی خوایە و، "لە نیشانەکانی خۆشەویستیی دۆست پێشخستنی هەموو ئەو کاروبارانەی ئەودنیا کە دەبنەمایەی نزیکبوونەوە لە خۆشەویست بەسەر هەموو ئەو کاروبارانەی ئەم دنیایە کە نەفس ئارەزوویاندەکات، المکی (١٤١٧ ھ – ١٩٩٧م) ٢ / ٨٤". واتە خودی بڕیاری خۆشەویستییەکە بریتییەلەوەی لە سۆفیگەریدا پێیدەگوترێ "فەوتانی کردەوە – فناء الافعال" بە خۆپاراستن لە کردەوە بێزراو – ناشیرین –ەکان و نەکردنیان و "هەر کەسێك رەوشتی خۆی چارەسەرکرد و لە دڵی ئێرەیی و رق و قرچۆکی و بەرچاوتەنگی و تووڕەیی و لووتبەرزی و هاوشێوەکانی ئەمانە لە سەرچڵییەکانی نەفس خاوێنکردەوە، دەگوترێ: لە رەوشت خراپی فەنابوو – رزگاریبوو –، القشیری (١٤٢٦ ھـ - ٢٠٠٥ م)، ١٠٣"یان "فەوتان – رزگاربوون بە دوورخستنەوە – لە هەموو شتێك بەو مەبەستی خۆتەرخانکردن بۆئەوەی خۆی لە هەموو شتێك دوورخستووەتەوە بۆ ئەو، الکلاباذي (١٤٢٧ ھـ - ٢٠٠٦ م)، ٩٠".

بەگشتی، مەرجی بناغەیی خۆشەویستی – پێشمەرج –ی ئەو بڕیارە خۆڕزگارکردنە لەوەی لەگەڵ بنەماکانی خۆشەویستیی راستەقینە ناگونجێت و، ئەمەش رەنگدانەوەی راستەوخۆی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:

(قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ

اللَّـهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّـهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّـهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ / التوبة ٢٤).

هەر بەو مەعنایەی ئەو بەیتەی مەحوی، پێش سەدان ساڵ، مەولەویی رۆمی (جەلالەددین رۆمی ٦٠٤ – ٦٧٢ ك، ١٢٠٧ – ١٢٧٣ ز) گوتوویە:

هیچ کس را تا نگردد او فنا          نیست ره در بارگاه کبریا

**"مثنوی معنوی، دفتر ششم، ب ٢٣٢ / ١٠٥٤ و سجادی (١٣٧٩ هـ. ش)، ٦٢٨"**

واتە:"هەر کەسێك تا نەفەوتێ – فەنا نەبێت –، رێگەی بۆ بارەگای کیبریا – خوای گەورە – نییە"، واتە ناتوانێ روو لەو بارەگایە بکات.

لە دووەمین بەیتی بە نموونە هێنراودا، بە رواڵەت مەبەستە ئایینییە باوەکەی ئەوەی "ئەم دنیایە وێستگەی تاقیکردنەوە و پەڕینەوەیە بۆ ئەودنیا" دووبارەکراوەتەوە. ئەمە، ئەگەر ئەو بەیتە بەتەنیا لێکبدرێنەوە راستە، بەڵام بەیتی پاش ئەوە دەڵێ:

"مەحویا"بازێکی تۆ، قودس ئاشیان
بوونە بوومی شوومی ئەم وێرانە بۆچ!

خۆ بە"باز"لێچواندن و گرێدانی ئەوەش بە "قودس ئاشیان – هێلانەی پیرۆز"ەوە لە یەکەمین بەشی ئەم بەیتە و، لێچواندنی وابەستەیی بەم دنیایە بە پیشەی"بووم – کوندەبەبوو – بایەقوش" دانانی دنیاش بە

"وێرانە" پتر لە چەمکی عیشق و تێگەیشتنی سۆفییانەی پەیوەندییەکانەوە نزیکماندەخاتەوە، نەك تێگەیشتنە باوەکە.

لە بەیتەکانی سێیەمین نموونەدا دەستپێکی "رووتی دی -رووی تۆی بینی- لەوڕۆژەوە، گەر رۆژە سەرگەردانە رۆژ "ئەوەمان بۆ دەردەخات کە جوانیی یار "مەعشووق" سەرچاوەی ئەم خۆشەویستییە نائاساییەیە، ئەمەش ئاساییە. لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە: (اللّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ/ النور ٣٥) - رووناکیی ئاسمانەکان و زەمین -ە، بەلاّم بۆ کاریگەریی ئەو جوانییە، سەرچاوەکانی سۆفیگەری پەنادەبەنەبەر چیرۆکەکەی حەزرەتی مووسا (ع) لە کێوی "طور"و داخوازیی بینینی خوای گەورە: (وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَـكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ / الاعراف ١٤٣)و، لەمەش چەمکی تەجەللی -دەرکەوتن-، ئەگەرچی ناڕاستەوخۆیە و بۆ کێوەکەشە، وەردەگرن، لەگەڵ کاریگەریی ئەو تەجەللییە بەسەر حەزرەتی مووسا (ع)و، بوونی ئەوە بە رێسایەکی گشتیی کاریگەریی نائاسایی و یەکلاکەرەوەی ئەو جوانییە. لە سایەی ئەمەوە ئاساییە کە رۆژ - خۆر-، پاش بینینی رووی یار، ئەگەر کاتەکە رۆژ بێت ئەوا ویست و هۆشی خۆی لەدەستبدات و سەرگەردانبێت، ئەگەر کاتەکە شەوبێت، هەر قوڕی دووریی یار بپێوێت. ئەمە، هەر لە روانگەی ئەو بەیتانەوە، ئاساییە چونکە "رەهرەو - رێبوار -ی رێگەی مەحەببەت وا دەبێ"، لە کۆششی بەردەوامی شەووڕۆژدایە تا "لەم رێگە کاری سەردانانە رۆژ".

سێیەمین بەیتی ئەو نموونە هێنانەوەیەش "نووری جیلوە"ی تێدابەکارهێنراوە کە وشەی "نور" ئایەتی "النور ٣٥"و وشەی تجلی" فلما تجلی ربه.."ی ئایەتی"الاعراف ١٤٣"مان بیردێنێتەوە کە بووەتە مایەی ئەوەی: "دەوری بۆ ئەم شەمعەیە دایم وەکو پەروانە رۆژ"، واتە بۆ خۆفەوتاندن.

لە چوارەمین نموونەدا تەعبیر لە سەختیی لەرادەبەدەری رێگەی گەیشتن بە یار "مەنزڵی یار –مەنزڵی سەلما" کراوە. لەو بەیتەدا شاعیر دەڵێ "ئەگەر بە هەر هەنگاوێك سەد دە فرسەنگ – نزیکەی شەش هەزار کیلۆمەتر ببڕیت" ئەوا بە "سەد قەرن – سەد سەدە – دە هەزار ساڵ" دەگەیتە ئەو مەنزڵە، بەلاّم ئەمە تەنها یەك لایەنی دەربڕینی ئەو سەختییەیە، چونکە لە نۆیەمین نموونەدا ئەو رێگەیە بریتییەلە زنجیرەیەکی بەردەوامی "کێوی غەم، وادیی جەفا"و، لە هەشتەمین نموونەشدا دوورە لە ئاسایش، چونکە "رێگەی مەهلەکە"یە. هەر لەم روانگەیەوە شاعیری گەورەی ئێران حافظ (شیرازی ٧٢٧ – ٧٩٢ ك، ١٣١٠ – ١٣٧٣ ز) دەڵێ:

شب تاريك و بيم موج و گردابی چنين هايل
كجا دانند حال ما، سبكباران ساحلها

**"ديوان حافظ ١ أ ٥، ٩٨"**

واتە:"شەوی تاریك و ترسی شەپۆلی توورە و گێژاوێکی ئاوەها ترسناك – ئەمە حاڵی ئێمەیە –، بارسووکانی رۆخی دەریا چۆن – کەی – بەم حاڵەی ئێمە دەزانن"

لە پێنجەمین نموونەدا بە روونترین شێوە مەبەستی شاعیر لە وشەی"رێگە"مان بۆ روونەدەبێتەوە کە"طەریقەتی[٦] عیشق"ە و"مەحوی"بە رێبازی یاران – اصحاب – ی پێغەمبەر (س) یش ناویدەبات و، بە مایەی وەدەستهێنانی پلەی پێگەیشتن"مەرتەبەی وسوول"یشی دەزانێ. ئەمە تەنها بۆچوونی شاعیرمان نییە، بەڵکو هەموو سۆفییەك لەو باوەڕەدایە کە خۆشەویستیی مەعشوق – خوای گەورە– رێگەی پێگەیشتنە، مەولانای رۆمی دەڵێ:

عشق آن بگزین که جمله انبیا
یافتند أز عشق او کار و کیا

**"مثنوي معنوي (١٣٧٩ ه. ش)، دفتر اول، ١١"**

واتە"عیشقی ئەو کەسە هەڵبژێرە کە سەرجەمی پێغەمبەران لە عشقی ئەودا شانوشکۆیان وەدەستهێنا"و، ئاشکرایە کە لەم بەیتەدا شکۆی عیشق گەورەترە لەوەی لەو دوو بەیتەی"مەحوی"دا دەتوانرێ بەدیبکرێت، ئەگەرچی خۆشەویستیی خوا بنەمای هەرە گەورەی باوەڕی راستەقینەیە، چ لەلایەن پێغەمبەرانەوە (ع) بێت یان وەلی و خواناسانی گەورە یان بڕوادارانی ئاسایی.

لە شەشەمین نموونەدا عیشق بووەتە "مەنزڵ – خان"ی نیشتەجێبوونی خواستراوی شاعیر:"دیارم دەیری عیشقە"و، ئەمەش هەم تەعبیر لە"ویست – ئیرادە"ی شاعیر دەکات و هەم رەنگدانەوەی ئەو ویستەی تێدابەدیدەکرێت لە بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی ناخدا. ئەوەی بەڵگەی ئەو ویست و بڕیارە یەکلاکەرەوەیە تەواوکەری خودی ئەو

دەستنیشانکردنەیە: "دیارم دەیری عیشقە"بە"جیٚ بە سووتن بیٚ لەویٚ دەگرم"ە، واتە ئەگەر نرخەکە سووتانیشم بێت ئەوا هیچ شوێنێکیدیکە بۆ ئەو مەبەستە هەڵنابژێرم. شاعیر بەوەشەوە ناوەستیٚ بەڵکو پاساویش بۆ ئەو بڕیارە دێنێتەوە: "کە من مشتیٚ چڵ و چێوم بە چی بم، کەڵکی کیٚ دەگرم !؟". هێنانەوەی پاساو، لە هەموو شتێکدا بە مەبەستی عەقلانیکردن"Rationalization"ی ئەو شتەیە و لە زمانی ئینگلیزیدا ئەو وشەیە بە هەردوو مەعنای عەقلانیکردن"عقلنە"و پاساو هێنانەوە "تبریر"یش بەکاردەهێنرێت. کەواتە ئەو شێوازە، لەلایەن شاعیرەوە، هەوڵێکی بۆ بەکارهێنانی میتۆدی عەقڵی بۆ گواستنەوەی ئەزموونی سۆفیگەری کە هەژموونی"ئاوەز – عقل"، بەڵکو هەر رۆڵێکی عەقڵ لە تیۆری زانستی خۆیدا رەتدەکاتەوە. ئەمە رێك ئەو خاڵەیە کە "ستەیس – Stace" لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە ئەگەری نووسینی فەیلەسوف لەسەر سۆفیزم ورووژاندوویەتی کە دەڵیٚ: "خاڵێکیدیکەش هەیە کە فەیلەسوفی ناسۆفی دەتوانیٚ بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاربێنیٚ و ئەو خاڵەش ئەوەیە کە سۆفییەکان خۆیان دەفەلسەفێنن و کە ئەوەش دەکەن دادەبەزنە ئاستی عەقڵی، لەئەنجامی ئەمەشدا ناتوانن چاوەڕوانی ئەوە بن کە لە چنگی شیکردنەوە و رەخنەی عەقڵی دەربازبن، ستیس (١٩٩٩)، ٣٧ ".

لە دووەمین بەیتی شەشەمین نموونەدا شاعیر پەنادەباتەبەر پلانی دارێژراو لەسەر بناغەی چەند قۆناغ، بەو مەعنایەی ئەگەر قۆناغێك سەرینەگرت –سەر نەکەوت–، قۆناغیدیکەی جیاواز هەبێت بەو مەبەستەی ناچارنەبێت سەرلەنویٚ لە سفرەوە دەستپێبکاتەوە:"نەگەییە

دامەنی دەستی، دوعا..."دوو لێکدانەوە هەڵدەگرێ، یەکەمیان: "بەپاڕانەوە – دوعا – هیچم پێنەکرا بۆیە دەبمە خاکی ڕێی"و، دووەمیان: "ئەگەر پاڕانەوەم نەگەیشتە دامەنی دەستی – گیرانەبوو – ئەوجا ناچاردەبم ببمە خاکی ڕێی"، ئەگەرچی دووەمین لێکدانەوە لە ڕووی مەنتیقی ناوەوەی بەیتەکەوە تۆکمەترە. لە هەردوو حاڵەتیشدا ئەو دووەمین قۆناغ "قۆناغی بەدیل – Alternative"ە هەیە، بەپێی یەکەمین لێکدانەوە، شاعیر لە سەروبەندی جێبەجێکردنی ئەو قۆناغەدایە و بەپێی دووەمین لێکدانەوەش ئەو قۆناغە لە مێشکی شاعیردا ئامادەیە و جێبەجێکردنی بەندە بە سەرگرتن و سەرنەگرتنی پلانی بناغەیی. بیرۆکەی بناغەیی ئەم دانانی چەند قۆناغە پتردەکرێ ببەسترێتەوە بە پێویستیی بوونی چەند "گریمانە – Hypothesis"یەك بە مەبەستی کارکردن لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی پتر کارایی خۆی دەسەلمێنێ. لە دووەمین بەشی ئەم بەیتەدا دەرك بە جیاوازی دانان لەنێوان دوو ئاراستەدا دەکرێ: "ئاراستەی گۆشەگیری"، شاعیر ناوی "طەریقەی گۆشەگیری"ی بۆ بەکارهێناوە و "ئاراستەی ڕووبەڕووبوونەوە یان تێکەڵی" کە شاعیر بە "دوعا" تەعبیری لێکردووە. ئەم پۆلێنکردنە، ئەگەرچی لێرەدا تەنها بۆ دەربڕینی هەڵوێستی شاعیرە –سووربوونی لەسەر هەڵبژاردنەکەی خۆی–، بەڵام لە جەوهەری مەسەلەکەدا باس لە هەردوو ئاراستەکە لە سۆفیگەریدا کراوە و بە کردەوەش ئەم مەسەلەیە دوورنییە پیادەکردنێك بێت بۆ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (س) کە دەڵێ: (المُؤمِنُ الّذي يخالِطُ النّاسَ و يَسبِرُ على أذاهُم أعظَمُ أجرا مِن المُؤمِنِ الّذي لا يُخالِطُهُم و لا يَسبِرُ على أذاهُم، ابن ماجه ٢ / ١٣٣٨ ح ٤٠٣٢، سنن البيهقي الكبرى

١٠ / ٨٩ ح ١٩٩٦٢، مُسنَّف إبن أبي شيبـة ٥ / ٢٩٣ ح ٢٦٢٢٠، مسند إبن حنبل ٢ / ٤٣ ح ٥٠٢٢، الُمعجّم الأوسط ٦ / ١٠٩ و ١١٠ ح ٥٩٥٣ و، تاد...".

واتە ئاراستەی رووبەڕووبوونەوە، لەم روانگەیەوە سوونەتگەراتـرن, بەگشتیش "مەحوی" نەقشبەندی" لێرەدا یـەکـێـك لـە پـرنسـیـپـە بناغەییەکانی ئەو تەریقەتەمان بیردەخاتەوە کە بە "خلوە در انجـمـن – خەڵوەت لە نێو کۆمەڵدا" ناسراوە. لەم دواییانەشدا دوکـتـۆر "جـاویـد ئیقباڵ"ی کوڕی فەیلەسوفی گەورەی هیندستان "محەممەد ئـیـقـبـاڵ " جەختی لەسەر ئەوە کرد کە باوکی "داکۆکیی لە عیشـقـی خـواوەنـدی کردووە، بەوپێیەی کە هێزێکی کارا و داهێنەرە و ددانی بە راستییەکانی جیهاندا ناوە و هەوڵی چاککردنەوەی جیهانی داوە. لـەبـەرئـەوەش ئـەو سۆفیگەرییەی رەتکردووەتەوە کە جـەخـتـی لـەسـەر کشـانـەوە یـان گۆشەگیربوون لە کۆمەڵ کردووە، "اقـبـال (٢٠٠٩) ". بـیریـاران و مێژوونووسانی بیری ئیسلامی پتر ئاراستەی کارا و تێکەڵ بە کـۆمـەڵ و بنیاتنراو لەسەر سەرەتاکانی پێشەنگانی سۆفیگەرییان پەسەندکـردووە و ئاراستەکەیدیکەش، کە لایەنی تیۆریی بەسەردا زاڵبووە، ناپەسەند بووە و ناوی "سۆفیگەریی فەلسەفی"یان لێناوە "العسقلانی (١٩٧٢ ط ٢) ١ / ٢١٦، الذهبی (بلا تاریخ) ٢ / ٥٠٢".

لە شەشەمین نموونەدا"مەحوی"خاڵێکی ئـیـجـگـار هـەسـتـیـار دەوروژێنێ: "ئامانجبوونی عیشق"، بەو مەعنایەی خودی عیشـقـەکـە، بەدەر لەوەی ئایا دەتگەیەنێ بە یار یان نەء، بـۆ خـۆی مـەبـەسـت و ئامانجە: "بلاَ نەیشیگەمێ"، واتە با نەیشیگـەمـێ – بـە یـار – و،

عیشقەكە خۆی بە مایەی "سەر سەرئەفرازی – سەرفرازیی سەر" لەقەڵەمدراوە و ئەو خاڵەی كە مایەی ئەو "سەرفرازییەی سەر"ە"بە سەر نەك پێ.. بە ڕێگەی یاردا (لأبُدّ منه)ە دوو بە دوو ڕۆیین"[7]. ئەم مەعنایە: "ئامانجبوونی خۆشەویستی – عیشق" لە چەندین شوێنی دیوانی شاعیردا بە زەقی دووبارەبووەتەوە، لەوانە هەموو غەزەلی (١١ ه، ٢٣٣ تا ٢٣٥)و هێندەش لەو مەبەستەدا قووڵدەبێتەوە كە لە هەڵبژاردنی "سەرمەشق – مامۆستا"شدا هەر بەو گیانەوە سەوداكەی خۆی بەسەردەبات، چ بتوانێ یان نەء.

دەرسی عیشقم هەر لە كن پەروانە یا بولبول بووە
بیگەمێ، یا نەیگەمێ، هەر مەشقی ئوستادێ دەكەم

**١١ ن ٥، ٢٣٤**

ئەمەش بنەمایەكیدیكەی "پایەی خۆشەویستی – عیشق" لە میتۆدی سۆفیگەریدا دەخاتەڕوو.. لە دەیەمین نموونەدا كە شاعیر دەڵێ: "گوم كە بوو ڕاهی هودا شاهڕەهە گومڕاهی"، واتە: كە ڕێگەی ڕاستی – ئەوەی خوا بۆ خەڵكی هەڵبژاردووە – ونبوو، ئەوا "گومڕایی – لە ڕێگە لادان - بزركردنی ڕێگەی ڕاست "دەبێتە شاڕێ. ئەمە یەكەمین بەشی بەیتی (٣ ل ٨، ٢٠٨)مان دێنێتەوەبیر كە دەڵێ: "ڕێگەی هودا طەریقەتی عیشقە"و، بەمەش "مەحوی" بەرەو خاڵێكی گرنگمان دەبات لە میتۆدی سۆفییاندا كە مەسەلەی "چارەنووسی بناغەیی"یە، ئەو چارەنووسەی بە لێكدانەوەی سۆفییانەی ئەم ئایەتە پیرۆزە بە "عیشق" لێكدراوەتەوە:

وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَا ۛ أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ/ الاعراف ١٧٢)،

کە لە ئەدەبییاتی سۆفیگەریدا بە "ڕۆژی ألست"و "قالوا بلی" ناسراوە (٨). لای "مەحوی" خۆی چەندین ئاماژە بەدیدەکرێت. لە بەیتێکدا باسی "چارەنووسی ئەزەلی" بەمشێوەیە دەکات:

واعیظ لە ڕەندی مەیکەدە دەگرێ کە ئیعتیراض
راضی نیە بە سەرنویشتی ئەزەل (إنَني لراض)

**١ ض ١، ١٥٦**

وشەی"سەرنویشت"فارسییە و بەمشێوەیە دەنووسرێت "سرنوشت"و دەقاودەق مەعنای "چارەنووس" دەبەخشێ، واتە"مەحوی" هەمان چەمکی "چارەنووسی ئەزەلی"یەکەی بەکارهێناوە و "إنَني لَراض"ی عەرەبیش مەعنا "من قایلم – رازیم –" دەبەخشێت و ئاماژەیە بۆ "قالوا بلی شهدنا"ی ئایەتی (الاعراف ١٧٢) کە دەقەکەی لە چەند دێڕی پێشوودا هێنراوەتەوە. وشەی"ڕەند"یش فارسییە و لە رووی زمانەوانییەوە مەعنای: "زیرەك، هۆشیار، بێباك و بێپەروا، عمید (١٣٨١ه. ش)، ٢/ ١٢٥٤"و" ئەوەی پابەندی ڕێوڕەسم و نەریتە گشتی و کۆمەلایەتییەکان نەبێت، ئەوەی رواڵەتی مایەی گلەیی و ناخی بێگەرد بێت، معین (١٣٨٤ ه. ش) ٢ / ١٣٥٢"دەبەخشێت و لە رووی زاراوەییشەوە: "کەسێکە هەموو رواڵەتەکانی فرەگەری – الکثرة – و شتە شیاو و ویستراوەکان، چ هەبن و چ رەنگە بن و سیفەتی فیزیکی لە

خۆی دووربخاتەوە و سەرفراز بێت لە جیهان و خەڵکی بەوەی پـێـویسـتـی پێیاننەبێت، سجادی (١٣٧٩ هـ. ش)، ٤٢٦". وەکو لاهووری دەڵـێـت: "رەند لای شیرازی – حافظ – هێما "رمز"ە، لاهوری (١٣٨٥ هـ. ش)، ١/ ١٤"و، لە راڤەکردنی بەیتی:

گـــــر بود عُمر بمیخانــه رسـم بار دگـر
بجــز أز خدمت رنـدان نكُنـم كار دگــر

**دیوان حافظ، غ ٢٥٢ ١ / ٢٢٧**

لاهووری لە بارەی وشەی "مــەی – مــەیخـانــە"وە دەڵـێ: "لـە مەعنای سەرەتایی – مەبەستی مەعنای زمانەوانییە – شەرابی لە رەز –ترێ – دروستکراوە و لە مەعنای ئیشاریشدا – مەبەستی مــەعــنــای زاراوەیی بواری سۆفیگەرییە – خۆشەویستیـی تـەواوە کـە روالـەتـی خۆشەویستی و ناواخنیشی تێیدا هەر یەکە، لاهوری (هـ. س)،١ / ٦٧".

لەم روونکردنەوەیانەوە ئەوەمان بۆ روونەبێتەوە کە "واعـیـظ"ی ئەو بەیتەی "مەحوی"، کە رەخنە لە رەندی مەیکەدە "مەیخانە" دەگرێ و مەیخانەش مەعنای مەڵبەندی "خۆشەویستیی تەواو و تێکەڵنەبوو بـە هەر مەبەست و ئامانجێکی دنیایی "دەبەخشێت.. ئەو خۆشەویستیـیـەی کە لە "چارەنووسی ئەزەلی"ی مرۆڤدا بۆی نووسراوە، ئەوا لە جەوهــەردا ناقابیلە بەو پەیمانەی مرۆڤــ، لە ئەزەلەوە، بە خوای داوە سەبارەت بەوەی خۆشیبوێت. لە شیعری فارسیدا، بۆ نموونە لای حافـظ، دەتوانـرێ دەیـان بەیت دەستنیشانبکرێن کە ئاماژەیانتێداکراوە بۆ ئـەو "چـارەنـووسـی ئەزەلی"یە، بە وشەی "ألست"، لەوانە:

مطلب طاعت وپیمان و سلاح أز من مست
که به پیمانه کشی شهره شدم روز ألست
**"د. ح، غ ٢٤ / ١، ١٥٨"**

مقام عیش مُیسّر نمی شود بی رنج
بلی بحکم بلا بسته أند عهد ألست
**"د. ح، غ ٢٥ / ٥، ١٥٩"**

برو أی زاهد و بر درد کشان خُرده مگیر
که ندادند جُز این تُحفه به ما روز ألست
**"د. ح، غ ٢٦ / ٥، ١٥٩"**

ئەم دوا بەیتە پتر لە گیانی ئەو بەیتەی "مەحوی"یەوە نزیکە، چونکە "زاهد"ی ئێرەی "حافظ"وەکو"واعیظ"ی ئەو بەیتەی"مەحوی"رەخنە دەگرن، بەلاّم ئەوەی لای شاعیری خۆمان بە"رەندی مەیکەدە"ناو براوە لای شاعیری ئێران بە"درد کشان – دەردەداران و ما – ئێمە"یە و ئەوەی لای شاعیری ئێمە بە "مەی"ناوبراوە –چونکە لە مەیکەدە "مەیخانە"دا داوای مەی دەکرێت –لای شاعیری ئێران" تُحفە – توحفەی "رۆژی"ألست"ە. مەولانای رۆمی/ ش دەڵێ:

بُد عُمر را نام اینجا بُت پرست
لیك مؤمن بود نامش در ألست
**"مثنوی معنوی، دفتر أول ب ١٢٤١ / ٦١"**

هەر لە بواری"میتۆد"دا دەکرێ سەرنجی ئەوە بدرێت کە"مەحوی"لە شیعرەکانیدا ناوی هێندێك لە سەرچاوە گرنگەکانی "ئەزموونی سۆفیگەری"ی ناوبردووە و کاریگەری"یان بواری مەنهەجی"شیانی دەستنیشانکردووە. لە بەیتێکدا ئاماژە بۆ یەکێك لە سەرچاوە زۆر گرنگەکانی سۆفیگەری دەکات:

مەشغووڵی "شەرحی گوڵشەنی راز"م، دەفەرموێ
سینەم کە شەرحە شەرحە دەکاتن بە تێغی نـاز

**"١ ز / ٦، ١٣٤"**

"گلشن راز"یش کتێبێکی فارسیی بەناوبانگە "مەحموودی شەبوستەری"دایناوە و دەکرێ کە بگوترێ جۆرە فەرهەنگێکی تایبەتی زاراوە هەرە باو و گرنگەکانی بواری سۆفیگەرییە بە شیعری بەرز هۆنراوەتەوە. جگەلەو کەسانەی لە دواپەراوێزی لاپەڕە"١٣٤"ی دیواندا ئاماژەی بۆکراوە، یەکێك لە دواڕاڤەکارانی بەناوبانگی ئەو کتێبە "لاهیجی"یە. شاعیر بەوەی دەڵێ: (کە یار سینەم بە تێغی ناز لەتلەتدەکات، دەڵێ من خەریکی راڤەکردنی "گوڵشەنی راز"م)، دەیەوێ ئەوە رابگەیەنێ کە دڵی خۆی مەڵبەندە هێما ناسك و وردەکانی بواری سۆفیگەرییە.

لە بەیتێکیدیکەشدا، کە لە بێ پایانیی بواری هەمیشە پڕ شۆر و جەنجاڵەکەی عیشقی سۆفییانە بەم رادەمێنێ، ئاوڕ لە دوو سەرچاوەی گرنگیدیکەی ئەو بوارە دەداتەوە:

باسی چبکەم، بێ کەرانیی بەحری پڕ تەشویری عیشــق !؟
تاقــــــە قەطرێکی (فوتووحـات) ە، نمێکە (مەثنــە وی)
**"١٢ ی / ٧، ٣١٨"**

لە پەراوێزی ئەم بەیتەدا لێکدەرەوانی دیوان ئاماژەیان بۆ هــەردوو کتێبەکە و دانەرانیان کردووە. هێندەی پێویستە بگوترێ ئـەوەیـە کـە (الفتوحات المکیــة في معرفة الأسرار المالکیة و الملکـیـة) سـەرەکـیـتریـن کتێبی ئیبن عەرەبی (محیی الدین، ك ٦٣٨ کۆچی — ١٢٤٠ ز)ی خاوەنـی تیۆریی جێی مشتومڕی زۆری "یەکێتیی بوون — وحده الوجود"ە و ئـەم کتێبە و کتێبی "فصوص الحکم" دوو بەناوبانگترین دانراوی ئەون.

لە یەکێك لە بەیتە تاکەکانیـشـیـدا شـاعـیر، وێـڕای دووبـارە ناوهێنانەوەی کتێبی "الفتوحات..." ناوی یەکێك لە سـەرچـاوە هـەرە گرنگەکانی سۆفیگەری و بەتایبەت تەریقەتی نەقشبەندی دەکات:

بکە سەیری (فوتووحات) ئەر گەرەکتە تۆ فوتووحی رۆح
کتێبــی دڵ موتالا کردنــە، بڕوانــە (مـــــــەکتووبات)
**"تاکی ژمارە ٥، ٣٦١"**

کتێبی"مکتوبات"یش بریتییەلە نامەکانی ئیمامی ڕەببانی (أحمـد بن عبدالاحد الفاروقی السرهندی ٩٧٠ — ١٠٣٤ کۆچی)، لە بناغەدا بـە زمانی فارسی نووسراون و بە هەمان ناو لەلایەن "محمد مراد المنزلوی"یەوە بە ناوی "المکتوبات"ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی. ئـیـمـامـی ڕەببانی بە "تازەکەرەوەی دووەمین هەزار ساڵەی کـۆچـی" نـاسـراوە و یەکێکە لە کاریگەرترین کەسایەتییە فکرییەکانی نـیـمـچـە دوورگـەی هیندستان و یەکێکیشە لە کاریگەرترین و ناودارترین کەسایەتییـەکـانـی

تەریقەتی نەقشبەندی. ئیمامی رەببانی خاوەندی تیۆریی "یەکێتیی شوهود – وحدە الشهود"ە کە لێکۆڵەرەوەکانی بواری سۆفیگەری بە بەرپەرچدەرەوەی "یەکێتیی بوون – وحدە الوجود"ەکەی ئیبن عەرەبیی لەقەڵەمدەدەن.

ناوهێنانی بەشێك لە سۆفییە ناسراوەکان و بەستنەوەی هێندێك ناو بەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی خەسڵەتێکیدیکەی شیعری "مەحوی"یە. لە بەیتێکدا ئاورِ لە مەسەلەیەکی گرنگی حەللاج (الحسین بن منسور بن محمد ٢٤٤ – ٣٠٩ ك، ٨٥٨ – ٩٢٢ ز) دەداتەوە و ناویشی تەنها بە وشەی "مەنسوور" دەبات:

با حەقیشی بێ، لە بۆ (مەنسوور) (أنا الحق) حەق نییە
شێتییە مەجنوون ئەگەر بێ نازی لەیلایی بکا

"٦ أ ٥، ١٩"

"با حەقیشی بێ"، بە روونی، ئاماژەیە بۆ ئەوەی، لانیکەم، شاعیر تێدەگا بۆچی حەللاج وایگوتووە، بەلاّم ئەوەی بەلاوە باشنییە چونکە ئەم عاشقە و ئەوەش لای خەڵقی چوونە نێو پێستی مەعشووقە، کەواتە رەوانییە عاشق بە چەشنی مەعشووق نازبکات . لەلایەکیدیکەوە ئەوە، لە جەوهەری ئەزموونی سۆفیگەریدا، رازە و نابێ بدرکێنرێ، چونکە ئەگەر مەبەستەکە ئەوە بێت کە خۆشەویستیی مەعشووق هێندە زاڵبووە بەسەر عاشقدا کە چیدی هەست بە خۆی ناکا و هەر ئەو دەبینێ، ئەوا تەنها ئەو کەسانە لەم مەبەستە دەگەن کە بەم مەعنایەی "عیشقی حەقیقی" عاشقن، ئیدی حەقە ئەو قسەیە بگاتە گوێی کەسانێك کە لەو رازە ناگەن.

لەو بەیتەدا ناوی شاعیر و عاشقی هەرە بەناوبانگی عەرەب (مەجنوون، قیس ابن الملوح العامری، کۆچکردووی ٦٦٨ ك)و "لەیلا"ی خۆشەویستیشی دەبات. ئەگەرچی ناوبراو سۆفی نییە، بەلاّم سەرچاوە گرنگەکانی سۆفیگەری چیرۆکی ئەو خۆشەویستییەی ئەو بە سەرمەشقی خۆیان دەزانن. یەکێك لە کۆنترین سەرچاوەکانی ناساندنی بواری سۆفیگەری لە ئەبوبەکری شیبلی (دُلَف بن جحدر، ٢٤٧ – ٣٣٤ ك) دەگێڕێتەوە: "مەجنوونی بەنی عامر ئەگەر لەبارەی لەیلاوە لێیانبپرسایە دەیگوت من لەیلام و، بە لەیلا لە لەیلا بزردەبوو تا لەیلای بە چاوی خۆی دیبایە و لە هەموو مەعنا و مەبەستێکی غەیری لەیلا بزریدەکرد و هەموو شتەکانی بە لەیلا دەبینی. کەواتە چۆن ئەوەی لافی خۆشەویستیی ئەو –خوای گەورە– لێدەدات ئەو لافە لێدەدات و تەندروستە و ئاگای لە خۆی و زانیاری و شتەکانی خۆیەتی، السراج الطوسي (١٩١٤)، ٣٦٠ ". ئەم توانەوەیەی مەجنوون لە عیشقی لەیلادا، تا ئەوڕادەیە، بەپێی هەموو تایبەتمەندییەکی سۆفیگەری، ئەو خەسڵەتە بناغەییەیە کە دەبێ لە عاشقی راستەقینەدا رەنگبداتەوە، هەر ئەوە دەیکاتە "رەند"و هەر نەبوونی ئەوەش بۆتە مایەی ئەوەی هاوشێوەکانی "حافظ"و "مەحوی"و غەیری ئەوان تانە لە "واعیظ"و "زاهید"و "سۆفی"ی بێناواخن بدەن."مەحوی"لە دەیان بەیتی دیکەدا، راشکاوانە و راستەوخۆ یان لە پەناوە ناڕاستەوخۆ، باسی حەللاج و مەجنوون دەکات.

بایەزیدی بەستامی (طیفور بن عیسی بن شروسان ١٠٨–٢٦١ ك) یەکێکیدیکەیە لەو سۆفییانەی "مەحوی" لە شیعرەکانیدا ناویهێناون:

دەبینی بایەزیدە وەك یەزیـــدێکی دەبینن خەڵـق
بەبێ پەردە شەیاطینی لە ئەحواڵی مەلەك دەدوێ

**"١٠ ی ٣، ٣١٣"**

ئەو شێوە ناوهێنانەش هاوسۆزییەکی گەورەی پـێـوەدیـارە و بـە زانینی ئەوەی "بایەزیدی بەستامی" یەکێکە لە کۆنترین ئەو سۆفییانـەی بە"شـــەتەح" ناسراون و خاوەنی هەردوو شەتەحی "سبحانی سبحانی ما أعظم شانی"و "ما في جبتي إلاّ اللّه"ە و ئەوەش بووەتە مایـەی ئـەوەی مشتومڕی گەورەی لەسەر بکرێ.

تا ئێرە هەوڵدراوە هێندێك لە چەمکە هەرە زەقەکانی پەیوەست بە مەسەلەی "میتۆد" لە شیعری "مەحوی"دا بخرێنەڕوو و لێرەشدا تەنها بە پێوانەی "مشتێك لە خەروارێك" مامەڵە لەگەڵ دەقەکانـدا کـراوە و،\ هەوڵێشدراوە لەوەشدا تایبەتمەندیی هەر بەیتێك لە رووی دەلالـیـیـەوە، رەچاوبکرێت و دوو نموونەی هاوئاست و هاوئاراستـە لـەهـەمـانـکـاتـدا نەهێنرێنەوە. بەو هیوایەی تەمەن رێگەبدات لە بەشەکـانـی داهـاتـوودا مەسەلەی "رەمزی مەعنەوێ"، بە تەعـبـیری خـودی شـاعـیر، واتـە زاراوەکانی ئەزموونـی سـۆفـیـگـەری بـەوشـێـوەیـەی لای شـاعـیر رەنگیانداوەتەوە، زاراوە زانستییەکانی بواریدیکە و رەهەندە ئۆنـتـۆلـۆژی "وجودی"، ئەخلاقی، سلوکی و ئەپستمۆلۆژی "مەعریفی"یەکانـی ئـەم بوارە و هێندێ تایبەتمەندییدیکەی سۆفیگەری لە شیـعـری مـەحـوی/دا شیبکرێنەوە و لەگەڵ شیعری شاعیرانی پێش خۆی و بۆچوونی سـەرچـاوە کۆنەکانی ئەو بوارە بەراوردبکرێن.



**پەراوێز:**

(١) وشەی"منهاج"ی ئەو ئایەتە پیرۆزە و "منهج"ی فەرموودەکەی پێغەمبەر (س) کە هەر لەم پەراوێزەدا دەقەکەی دەهێنرێتەوە و ناوی ئەو سەرچاوەیانەش کە فەرموودەکەیان لێوەرگیردراوە، هەر مەعنای "ڕێ-ڕێگە" دەبەخشن. زۆربەی کتێبەکانی تەفسیری قورئانی پیرۆز وشەی "المنهاج" بە "الطریق الواضح" یان "السبیل" لێکدەدەنەوە: البیضاوي ٢/ ٣٣١، القرطبي ٦/ ٢١١، الطبري ٦/ ٢٦٩، الدر المنثور ٣/ ٩٦، الثوري ١/ ١٠٣، مجاهد ١/ ١٩٨، البغوي ٢/ ٤٢، النسفي ١/ ٢٨٥، الآلوسي ٦/ ١٥٢ و تەفسیریدیکەش. چەند سەرچاوەیەکی بناغەیی فەرموودەش بەکارهێنانی وشەی"منهج" لەلایەن پێغەمبەرەوە (س) لەم فەرموودەیەدا دەسەلمێنن"من كان وصلة لأخيه المسلم الى ذي سلطان في منهج بر أو تيسير عسير أعانه الله على إجازة الصراط يوم تدحض فيه الأقدام، مسند الشهاب، ١/ ٣١٥ ح ٥٣٠ و ٥٣١، المعجم الاوسط ٤/ ٤٨ ح ٣٥٧٧، كشف الخفا ١/ ٣٠ ح ٤٣"

(٢) ناونیشانی کتێبەکەی بە وەرگێڕدراوی بۆ کوردی دەبێتە "گوتارێك لەبارەی میتۆدەوە، بۆ چەسپاندنی فەرماندەیی ئاوەز و بۆ گەڕان بە دووی ڕاستی لە زانستەکاندا". هێندەی ئاگاداربم تائێستا ئەم کتێبە قەبارە بچووك و پڕ بایەخە لەلایەن هیچ کەسێکەوە وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی.

(٣) بە هۆی پابەندیم بە دەقی لێوەرگیردراوەوە وشەی"بصیرە"ی عەرەبیم بەو شێوەیە وەرگێڕا، پێموایە باشترە "چاوی دڵ" بۆ ئەو مەبەستە بەکاربهێنرێ. "مەحوی" دەڵێ:

غائیب لە دیدە، چاوی سەرم، دڵمە پێتەوە
دەستم بە ئاسمانەوە، چاوم بە ڕێتەوە

**"١١ ھ ١ ل ٢٨٥"**

(٤) وشەی"ئەنارشیزم بە– الفوضویة– وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی و هێندێك لە نووسەرانی لای خۆمان بۆ وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی وشەی "ئاژاوەگێڕی" بەکاردێنن، بەلاّم لەبەرئەوەی وشەی "ئەنارشی- Anarchy" لایەنی لێکۆڵراو و ڕێکخراوی بەربەرەکانێکردنی دیاردەی باوی نابەجێدەگرێتەوە و دوور و هاودژی وشەی"Chaos"ە، کە مەعنای "ئاژاوە"،" تێکچوونی شیرازە"و " بێسەروبەری" دەبەخشێ، بۆیە هەر وشەی "ئەنارشیزم"م بەکارهێنا.

(٥) ئەو بەیتە تاکە و، لە تاکەکانیشدا ئاماژەی بۆ نەکراوە، چونکە وەکو مامۆستا "**محەممەدی مەلا کەریم**" جەختی لەسەر کردووە "پاش لێبوونەوە لە بەشی کوردیی" دیوانی مەحوی ئەو بەیتەیان پێگەیشتووە. ئەمە تەنها بەیتیشە وشەی "مەنهەج" تێدابەکارهێنراوە. لەبەرئەوەی شەقڵی تایبەتی "مەحوی" بەسەریەوە دیارە و ئەو مەنهەجەی باسیدەکات "مەنهەجی عیشقی حەقیقی – سۆفیگەری"یە و خودی شاعیریش لەو ئەزموونەدا پەیڕەوی لە "ڕێبازی عیشق" دەکات، هیچ پاساوێك نابینم ئەو بەیتە بە هی مەحوی نەزانرێت. هەڵبەتە

تائێستا نەمزانیوە کەس ئەو بەیتەی بە هی شاعیرێکیدیکە زانینێت یان گومانی لەوە بووبێ کە هی"مەحوی"یە.

(٦) لە قورئانی پیرۆزدا دووجار وشەی"طریقة" بەدیدەکرێت، یەکەمیان لە ئایەتی (نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا/ طه ١٠٤)دایە. وشەی"طریقة" لە "طه ١٠٤"دا مەعنای"ئاوەز–هۆش–عقل" دەبەخشێت، بەلاّم ئەوەی سوورەتی"الجن"لەلایەن لێکدەرەوە – مفسر – ەکانی قورئاندا بە چەندین مەعنا کراوەتەوە لەوانە:"تەریقەتی ئیسلام، الجلالین، ١/ ٧٧٢ و النسفی ٤/ ٢٨٨"،"تەریقەتی راستی و باوەڕ، البغوی ٤ / ٤٠٣"،" باشترین تەریقەت، الزمخشری ٤/ ٦٣٠"و" ئەو تەریقەتەی کە میللەتی ئیسلامە، ابو السعود ٩/ ٤٥". لە هەمووشیاندا وشەی"طریقة"مەعنای"الطریق – رێگە"دەبەخشێت، لەو بەیتەی"مەحوی"شدا هەر ئەو مەعنایە دەبەخشێ.

(٧) مامۆستایانی لێکدەرەوەی دیوانی شاعیر، لە پەراوێزی ئەو بەیتەدا ئەمەیان تۆمارکردووە:"با نەشکێم بە یار، ناچارم بە سەر هەر بە دوایدا بڕۆم، چونکە مایەی سەربەرزییە بۆم دووبەدوو بەڕێدابڕۆین، ئەو لەپێشەوە و من لەپاشەوە، هەموو جارێ سەرم لە جێگەپێکەیدا دانێم". راستییەکەی ئەوەیە کە کورد "دووبەدوو رۆیشتن" بۆ دوو کەس بەکاردەهێنێت کە هاوشانی یەك بڕۆن، نەك یەکێکیان لەپێشەوە بێت و، ئەویدیکە لەپاشەوە، بۆیە پێموایە کە مەبەستی شاعیر لە "دووبەدوو رۆیین" رۆیشتنیەتی لەگەڵ سێبەری یار و، ئەوەی ئەم لێکدانەوەیە

گونجاوتردەکات ئەوەیە کە دەڵێ:"بە ڕێگەی یاردا"، ئەمەش لەلایەکەوە واتە بەو ڕێگەیەی یار پێیداڕۆیشتووە، کەواتە ناکرێ هاوشانی یار بێت و، لەلایەکیدیکەشەوە واتە بەو ڕێگەیەی یار دەستنیشانیکردووە و بۆی هەڵبژاردووین، ئەمەش هەر هاوشانیی تێدابەدیناکرێت، هەروەها کوردیش دەڵێت:"دەڵێی سێبەرە هەر بە دواوەیەتی". ئەمەش پتر مەعنای بەیتەکە قووڵتردەکاتەوە.

(٨) لە خوێندنەوەیەکی تایبەت بە"ڕێبازی خۆشەویستیی سۆفیانە" لای "مەحوی"، کە کتێبێکی سەربەخۆیە و تائێستا چاپ نەکراوە، بەدرێژی باسی ئەو "چارەنووسی ئەزەلی"یەم کردووە، بۆیە لێرەدا تەنها ئاماژە بۆ هێندێ خاڵی زۆر گرنگی پەیوەست بەو بابەتە دەکەم. هیوادارم بتوانم ئەو کتێبە بەم زووانە بڵاوبکەمەوە و خوێنەری بەڕێز بتوانێ لەوێ ئەو مەسەلەیە بە دوورودرێژی ببینێ.



## سەرچاوەکان:

القرآن الكريم
ابن ابي شيبة (ابو بكر عبدالله بن محمد الكوفي):
١. الكتاب الصنف في الاحاديث و الآثار, تحقيق: كمال يوسف الحوت, مكتبة الرشد, الرياض, ط ١, ١٤٠٩هـ.
ابن حنبل (ابو عبدالله احمد الشيباني):
٢. مسند الامام احمد بن حنبل, مؤسسة قرطبة, القاهرة.
ابن ماجة (ابو عبدالله محمد بن يزيد القزويني):
٣. سنن ابن ماجة , تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي , دار الفكر , بيروت.
ابن منظور (محمد بن مكرم الافريقي المصري):
٤. لسان العرب, دار سادر, بيروت ط١, ١٩٩٨.
ابو السعود (محمد بن محمد العمادي):
٥. ارشاد العقل السليم الى مزايا القرآن الكريم, دار احياء التراث العربي, بيروت.
ابو النور (الدكتور احمد انور):
٦. ضد المنهج، ضمن كتاب (قضايا العلوم الإنسانية، إشكالية المنهج)، منشورات سلسلة كتاب الفلسفة والعلم، الهيئة المصرية لقصور الثقافة، وزارة الثقافة المسرية، مطبعة الأمل للطباعة و النشر، القاهرة، الطبعة الاولى ١٩٩٦م.
الازهري (ابو منسور محمد بن احمد):
٧. تهذيب الغة , تحقيق: محمد عوض مرعب, دار احياء التراث العربي، بيروت , ط١, ٢٠٠١م.
الآلوسي (ابو الفضل شهاب الدين السيد محمود البغدادي):
٨. روح المعاني في تفسير القرآن العظيم و السبع المثاني, دار احياء التراث العربي.
بدوي (الدكتور عبدالرحمن):
٩. مناهج البحث العلمي، وكالة المطبوعات، الكويت ١٩٧٧.

البغوي (ابو محمد الحسين بن مسعود):
١٠. معالم التنزيل المعروف ب"تفسير البغوي", تحقيق: خالد عبدالرحمن العك, دار المعرفة, بيروت.
بلحسن (عبدالسلام):
١١. قضايا المنهج عند ديكارت، ضمن: مدونة بلحسن لقضايا الفلسفة، الموقع الشخصي للكاتب، الانترنت.
البيضاوي (ناصر الدين ابو الخير عبدالله بن عمر بن محمد):
١٢. تفسير البيضاوي, دار الفكر, بيروت.
البيهقي (ابو بكر احمد بن الحسين بن علي):
١٣. سنن البيهقي الكبرى, تحقيق: محمد عبدالقادر عطا, مكتبة دار الباز, مكة المكرمة, ١٤١٤ هـ - ١٩٩٤م.
الثوري (سفيان بن سعيد بن مسروق):
١٤. تفسير سفيان الثوري، دار الكتب العلمية، بيروت، الطبعة الاولى، ١٤٠٢ هـ.
الذهبي (شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان):
١٥. المغني في الضعفاء، تحقيق، تحقيق: الدكتور نورالدين عتر.
حافظ (لسان الغيب):
١٦. ديوان حافظ, نسخهء قزويني, غنى, با مجموعهء تعليقات وحواشي علامهء: محمد قزويني, باهتمام: ع. جربزه دار , انتشارات اساطير, تهران, ضاث اول, زمستان ١٣٦٧هـ. ش.
حسن (الدكتور احمد عبدالمنعم):
١٧. اصول البحث العلمي، الجزء الاول، المنهج العلمي واساليب كتابة البحوث والرسائل العلمية، المكتبة الأكاديمية، القاهرة، الطبعة الاولى ١٩٩٦م.
ديكارت (رينى):
١٨. مقال عن المنهج لاحكام قيادة العقل وللبحث عن حقيقة العلوم، ترجمة و شرح وتصدير: محمود محمد الخضيري، المطبعة والمكتبة السلفية، القاهرة ١٣٤٨ هـ - ١٩٣٠ م.
راسل (برتراند):
١٩. اسول الرياضيات، ترجمة الدكتور محمد مرسي احمد والدكتور احمد فؤاد الاهواني،

مكتبة الدراسات الفلسفية بجامعة الدول العربية، الادارة الثقافية، دار المعارف، القاهرة ١٩٥٨.

٢٠. عرفان و منطق، ترجمهء: نجف دريابندرى، شركت سهامى كتابهاى جيبى، تهران، جاب دوم ١٣٦٢ هـ. ش.

الزمخشري (أبو القاسم محمود بن عمر بن محمد الخوارزمي):

٢١. أساس البلاغة، دار الفكر، بيروت ١٣٩٩ هـ - ١٩٧٩ م.

٢٢. الكشاف عن حقائف التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التأويل، تحقيق: عبدالرزاق المهدي، دار إحياء التراث العربي، بيروت.

زيدان (الدكتور يوسف)، مشرف و مقدم:

٢٣. مقدمة كتاب: قضايا العلوم الانسانية، مطبعة الامل للطباعة و النشر، القاهرة، ط١، ١٩٩٦.

ستيس (ولتر):

٢٤. التصوف و الفلسفة، ترجمة وتقديم الاستاذ الدكتور إمام عبدالفتاح إمام، مكتبة مدبولي، القاهرة، الطبعة الاولى ١٩٩٩.

سجادى (دكنر سيد جعفر):

٢٥. فرهنط إصطلاحات تعبيرات عرفانى، ويراستة ْ: سيد صادق سجادى، انتشارات طهورى، تهران، چاپ پنجم ١٣٧٩ ه. ش.

السعدي (ابو القاسم علي بن جعفر):

٢٦. الأفعال، عالم الكتب، بيروت، الطبعة الاولى ١٤٠٣ هـ - ١٩٨٣م.

السيوطي (جلال الدين عبدالرحمن بن الكمال):

٢٧. الدر المنثور, دار الفكر, بيروت , ١٩٩٣م.

الطبراني (ابو القاسم سليمان بن احمد):

٢٨. المعجم الاوسط , تحقيق: طارق بن عوض الله بن محمد وعبدالمحسن بن ابراهيم الحسني, دار الحرمين , القاهرة ١٤١٥ هـ.

٢٩. المعجم الصغير – الروض الداني-, تحقيق: محمد شكور محمود الحاج امرير, المكتب الاسلامي, دار عمار , بيروت ١٤٠٥ هـ - ١٩٨٥م.

الطبري (ابو جعفر محمد بن جرير بن يزيد بن خالد):

٣٠. جامع البيان عن تأويل القرآن, دار الفكر, بيروت, ١٤٠٥ هـ.
الطوسي (ابو نسر عبدالله بن علي السراج):
٣١. كتاب اللمع في التصوف, اعتنى بنسخه و تحقيقه: رنولد ألن نيكلسون, بريل, ليدن, ١٩١٤م.
العسقلاني (الحافظ شهاب الدين أبي الفضل أحمد بن علي بن محمد):
٣٢. الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة، تحقيق – مراقبة: محمد عبدالمعين ضان، حيدر آباد، الهند، الطبعة الثانية ١٣٩٢ هـ - ١٩٧٢ م.
العلواني (الدكتور طه جابر):
٣٣. الأزمة الفكرية ومناهج التغيير: الآفاق والمتطلبات، المعهد العالي للفكر الإسلامي، القاهرة، الطبعة الثانية ١٤١٧ هـ - ١٩٩٦ م.
الفراهيدي (الخليل بن أحمد):
٣٤. كتاب العين , تحقيق: د. مهدي المخزومي ود. ابراهيم السامرائي, دار و مكتبة الهلال.
الفضلي (الدكتور عبدالهادي):
٣٥. اصول البحث، منشورات الجامعة العالمية للعلوم الإسلامية، دار المؤرخ العربي، الطبعة الاولى ١٤١٢ هـ - ١٩٩٢م.
الفيروزآبادي (محمد بن يعقوب):
٣٦. القاموس المحيط , مؤسسة الرسالة , بيروت.
القرطبي (ابو عبدالله محمد بن احمد الانساري):
٣٧. الجامع لاحكام القرآن, دار الشعب , القاهرة.
القشيري (ابو القاسم عبدالكريم بن هوازن):
٣٨. الرسالة القشيرية , تحقيق ووضع الحواشي: خليل المنصور , دار الكتب العلمية , بيروت , ط٣ , ٢٠٠٥ م - ١٤٢٦ هـ.
القضاعي (ابو عبدالله محمد بن سلامة بن جعفر):
٣٩. مسند الشهاب , تحقيق: حمدي عبدالمجيد السلفي , مؤسسة الرسالة , بيروت , ١٤٠٧ هـ - ١٩٨٦.
الكلاباذي (تاج الاسلام ابو بكر محمد):

٤٠. التعرف لمذهب اهل التصوف , تحقيق: د. يوحنا الحبيب صادر , دار صادر , بيروت ,
ط٢ , ١٤٢٧ هـ - ٢٠٠٦ م.
لاهوری (ابو الحسن عبد الرحمن ختمی):
٤١. شرح عرفاني غزلهای حافظ، تصحیح و تعلیقات: بهاءالدین خرمشاهی، کورش منصوری، حسین مطیعی امین، نشر فطره، تهران، ضاث ثنجم ١٣٨٥ ه. ش
مجاهد (ابو الحجاج مجاهد بن جبر المخزومي):
٤٢. تفسير مجاهد، تحقيق: عبدالرحمن الطاهر محمد السورني، دار المنشورات العلمية، بيروت.
المحلي (عبدالرحمن بن ابي بكر) و السيوطي:
٤٣. تفسير الجلالين, دار الحديث, القاهرة, ط١.
مەحوی (مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عوسمانی باڵخی):
٤٤. دیوانی مەحوی, لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و محەممەدی مەلا کەریم, کۆڕی زانیاریی کورد, بەغدا, ١٣٩٧ هـ - ١٩٧٧ م.
محيريق (الدكتورة مبروكة عمر)
٤٥. دراسات في المعلومات و البحث العلمي و التأهيل و التكوين، عسمي للنشر و التوزيع، القاهرة ١٩٩٦ م.
مصطفى (ابراهيم), الزيات (احمد), عبدالقادر (حامد) و النجار (محمد):
٤٦. المعجم الوسيط, تحقيق: مجمع اللغة العربية, دار الدعوة.
معين (د. محمد):
٤٧. فرهنط معين, (دورۀ ٤ جلدي) , انتشارات زرين, تهران, با همکاری انتشارات نگارستان کتاب, تهران, ضاث اول, ١٣٨٢ هـ. ش.
المكي (ابو طالب محمد بن عطية الحارثي):
٤٨. قوت القلوب في معاملة المحبوب ووصف طريق المريد الى مقام التوحيد, ضبط و تصحيح باسل عيون السود , دار الكتب العلمية, بيروت, ط١, ١٩٩٧م.
النسفي (حافظ الدين ابو البركات عبدالله بن احمد بن محمود):
٤٩. مدارك التنزيل وحقائق التأويل, تحقيق: مروان محمد الشعار, دار النفائس للطباعة و النشر و التوزيع , بيروت, ١٩٩٦.

## کارەکتەرە ئایینیەکان لەنێوان تێروانینی مەحوی و حافزی شیرازیدا، "زاهید" بە نموونە

## حەبیب محەممەد دەروێش

کاتێك باس لەتەسەوف و عیرفان دەکرێت بە تایبەتی ئەگەر پەیوەندیەکی هەبوو بە عیرفان لە شیعری کوردیدا یان بە راوردکردنێك بێت لە نێوان شاعیرێکی عێرفانی گەلێکییتر و گەلی کوردا ، ناکرێت مەحوی لە لوتکە ی باسکردندا نەبێت، ئەگەر هەندێ لەشاعیرەکان لەکۆن و نوێدا شیعرێکیان وتبێ گفتوگۆ و قسەکردن بێت لەگەڵ رۆحی خۆیاندا بێت یا لەگەڵ رۆح و ناخی مرۆڤدا بێت، حاڵەتێکی کاتی و تێپەڕبووە و واقیعی ژیان خۆبان بەئاراستەیەکی تردا گوزەری کردووە و هەندێ جاریش بە ئاراستەیەکی پێچەوانەوە هەنگاوی ناوە، بەڵام مەحوی ئەو شاعیرەیە تائاستی توانەوە لەنێو عیرفاندا ژیاوە و دیوە مادیەوجودیەکەی بەزاندووە و گەیشتووەتە ئەو دویو وجود و لەجیهانێکی ئەفسوناویدا هاتۆتەگۆ و بەیتەکانی دەربڕیوە تائاستی نزیکبوونەوە لەشێوەی شیعری شەتەح.

لەبەرداری حەدا من بم ئەتۆ مەست
دەقازی (حەق) بلێ، حەق چ بەردار

**دیوانی مەحوی ل١٢٠**

وجودی هەموو بونەوەرەکان بەخودی مرۆڤیشەوە بەبوونێکی مەجازی زانیوە، چونکە کاتیە و دەبێ ئەم بوونە تێپەڕێنرێ بۆ بوونی حەقیقی،جونکە ئەم بوونە مەجازیە لای مەحوی رێگرە بالاْبوون و هەمیشە چەقین لەنێو ئەم بونە وشکەبێ رۆحەدا مرۆڤ لەتاریکیدا هێشتووەتەوە.

تاظولمەتی وجودە، تەریکی لەنوری عیشق

سێبەر نەما، هەتاوەکە مەحوی نەما خودا

**د.م ل٥**

مەحوی لەنێو تاریکیەکانی وجودەو بەرەو جیهانی عیشق ئاباد رۆشتووە، ئەگەرچی گرتنەبەری رێگای عیشق زۆر سەخت و پڕ هەوراز و نشێویش بوبێت، بەلاّم عالەمی عیشق و مەحەبەت لەئاخردا هەر برێژە.

ئابڕو رێژە و یصالی یار و خوێنرێژە فیراق

عالەمی عیشق و مەحەببەت هەربرێژە، هەر برێژ

**د م ل١٤٣**

دەزانم بادیەی عیشق خەتەرناك

کەچی هەرچووم، ئەگەر مام و ئەگەر چوم

**د م ل٢٢٥**

مەحرەمبوونی عاشق بەعالەمی عیشق، مانای مەحرەمبونیەتی بەو نهێنیانەی کەناتوانرێت لەجیهانی وجودا پەی پێ ببەی یان هەر تەسەوری بکەی، بۆیە ئەوانەی لەدەرەوەی عالمی عیشقدان دەبن بە (غەیر) و نابێ رازەکانی عیشقیان لەلادا بدرکێنرێ، بە درکاندنی رازەکان

لای نامەحرەم دەبێت ئە و ئامادەییە شت كردبێ هەر وەك مەنسوری حەلاج بڕۆیتە سەردار و ببوری لەسەری خۆت كە مەحوی پێیوایە نەدەبوو حەلاج ئەو رازی عیشقە ئیفشا بكات، چونكە كەسێك نەبووە لێی تێبگا و عوزرێكی بۆ بهێنێتەوە بەتایبەتی لەعالەمی شەریعەدا:

باحەقیشی بێ لە بۆ مەنسور (انا الحق) حەق نیە
شێتییە مەجنون ئەگەر بێ نازی لەیلای بكا

**د م ل١٩**

لەكاتێكدا لەزۆر رووەوە مەحوی كاریگەری مەنسوری حەلاجی لەسەر بووە و گە یشتوتە حال و مەقامێك حەلاجانە بێتە گۆ وهەر وەكو خۆیشی دەڵێ هەر قەسیدەیەكی بووە بە بەحری (انا الحق).

لەحەق بێژی بووە بەحری (انا الحق) هەرقەسیدێكم
لەباتی جائیزە و واجب گەرا قەتلم بكەن واجب

**د م لـ٤٥**

دێری دووەمی ئەم بەیتە هەمان دووبارە كردنە وەی بەیتێكی حەلاجە كاتێك دەڵێ:

اقتلونی اقتلونی یا ثقات
ان فی قتلی حیاة فی حیاة

هەر لەوجیهانی عیشقەدا مەحوی بەزمانی کوردی قەسیدەیەکی فێرکاری داناوە لەبری (هەمزیە) و (بوردە) بۆ خەڵکی موسوڵمانی کورد زمان هەروەك خۆی دەڵێ:

زوبانی عیشقبازی خۆشە گەر کوردی وەگەر تازی
قسەی بێ سۆزی عیشق ئەو گەوهەرە، مەحبوبی بێ ئانە

**د م ل٤٥٣**

جیهانی شیعری عیرفانی مەحوی جیاوازە لەهەر شاعیرێکی تر و زۆر بەقوڵی تەعبیری کەسێکە لەنێو ئەو جیهانەدا تواپێتەوە و گەیاندبێتیە لوتکە ،کە ئەو بەرزبونەوە و عروج کردنە ی مەحوی لەشیعری عیرفانی هیچ شاعیرێکیتری کوردا نابینرێ، مەحوی سۆفیەکی رەسمی نەبووە سەرەرای ئەوەی بەرەسمی تەمەسوکی کردووە لەسەر دەستی یەکێك لەشێخەکانی هەورامان، بەلاّم ئەگەر لەشیعرەکانی وردبینەوە مەحوی ئەوەندەی بەناخی خۆیدا رۆشتووە تاگەیشتۆتە ئەوعالەمە حەقیقیەی عیشق کەکاریگەریەکانی شێخەکەی پێوە نابینی، یان دەتوانین بڵێین ئەگەر کاریگەریەکی لە سە ر بووبێ زیاتر کاریگەری مەولانا خالیدی شارەزووری لەسەربووە و هەربۆ ئەویش قەسیدەیەکی تایبەتی داناوە و تیایدا ستایشی مەولانا دەکات، ئەگینا لەهەندێ لە بەیتەکانیدا هەروەك حافزی شیرازی (پیری موغان) بەپیری خۆی دادەنێ، هەروەك خۆی دەڵێ:

قەسەمی گوێمی بەچاوی بەچەدا پیری موغان

کە لەمـــەولا نەیبیێ وەعظ و قسەی مەولانا

**د م لـ٣٤**

مەحوی هەروەك شاعیرە کلاسکیەکانی ترمان کاریگەری شیـعـری شاعیرە گەورەکانی ئێرانیان لەسەربووە و لەسەروو هەموویانەوە شاعـیری گەورەی ئێرانی حافزی شیرازی کە ئێمە لێرەدا دەمـانـەوێ بـەراوردێـك بکەین لەنێوان مەحوی و حافزی شیرازیدا دەربارەی کارەکتەری ئاینی ،کە بەقەناعەتی ئێمە ئەو رەقیبەی کە لەشیعری شاعیرە عـیرفـانـیـەکـانـدا هاتووە ئەم توێژانەن کە نەگەیشتونەتە پلەی بەرزی عیرفان، ئەگەرچی بـە ئومێدبوون بگەن بەو ئاستە، بەلاّم بەهەرهۆیەکەوە بوبێت نـەیـانـتـوانـی بگەنە ئەو ئاستە بێجگە لەرەند و دەروێش کە لەشیـعـری مـەحـوی و حافزیشدا بەئیجابی باسکراون.ئەڵبە تە ئە وکارەکتە رە ئاینـیـانـە زۆرن (واعیز،سۆفی ،زاهید...هتد) بەلاّم لێرەدا تەنها کارەکتەرێکیانمان بـاس کردووە کە ئەویش (زاهیدە) بە تێروانینی مەحوی وحافزی شیرازی،بـە و ئومیدەی لە ئایندەدا لە جوارجێوەی کتێبێکدا باسی هـە مـوو ئـە و کارەکتە رە ئاینیانە بکەین لەتێروانینی مەحوی و حافزدا.

ئێمە لێرەدا بەراوردەکەمان لەگەڵ حافزی شیرازیدایە، چونکـە ئـەو کاریگەریەی حافز هەیەتی لەسەر شیعری مەحوی لەپێشتریش نالی هـیـچ شاعیرێکی تری ئێرانی ئەوەندە کاریگەری نەبووە، ئـەمـەش شـتـێـکـی سەیرنییە، چونکە حافز کاریگەری لەسەر بیرمەند و شاعیرە گـەورەکـانـی جیهان هەبووە تا ئەو رادەی (گۆتە) ی ئەڵمانی ئاواتە خوازبووە یـەکـێـك

بوایە لەشاگردەکانی، وە لەنێو ئێرانیەکانشدا حافز بە (زمانی غـەیـب – لسان الغیب) دادەنرێ و بەدیوانی شێعرەکانیشی پێشبینی ئایندەی خۆیانی پێدەکەن و بەختی پێ دەگرنەوە ،و ئەستەمە ماڵێك هەبێـت لـەئـێـرانـی فارسی زماندا دیوانی حافزی شیرازی تیانەبێت، ئێمە ناتوانین بڵێین مەحوی لەئاستی حافزدایە، بەلاّم مەحوی ئەگەر ئەو گرنگیەی حافزی پێ بـدرایـە هیچ نەبوایە کاریگەریەکانی لەنێو میللەتی کورددا لەحـافـز بـەنسـبـەت ئێرانیەکانەوە کەمتر نەدەبوو، ئەمەش بەشێکی زۆری دەگـەڕێـتـەوە بـۆ زاڵبونی مەسەلە ئایدۆلۆژیەکان هەم لەناو بزوتنەوەی رزگـاریخـوازی گـەلی کوردا و هەم لەنێو روناکبیرانی کورددا، کە تێڕوانینیان بۆ هەمـووشـتـێـك بەدەرنیە لە ێش داوەریە ئایدۆلۆژیەکان، سەرەرای ئەمەش بەداخەوە لەدوای راپەڕین و بەرقەراربونی حوکمداری کورد شیعری چەندەها شاعیری لاو ونوێ وەرگێڕدراوە بۆ زمانە بیانیەکان، بەلاّم تائێستا ئەوەندەی مـن ئـاگـادارېم بەزمانێکیتر شیعر و لێکدانەوە نەکراوە بۆ شاعیرە گەورەکانمان وەك (نالی و مەحوی و ... هتد.) ،کە دەبوایە تائێستا بەچەندەها شێوەو بـەچـەنـدەهـا زمان لێکدانەوەی بۆ بکرایە ، بەلاّم بەپێچەوانەوە لـەئـێـرانـدا شـاعـیرە گەورەکانیان وەك (حافز و مەولانای رۆمی و سەعدی) بەجیهانی کراوە، کە لەیەکێك لەم سالاّنەی دوایدا حەسنەوی مەولانا رۆمی بەئینگـلـیـزی پـڕ فرۆشترین کتێب بووە لە ئەمریکا، بێگومان ئە م بە جیهـانـیـیـکـردنـەی فەرهەنگە لە لایە ن ئێرانیەکانەوە ئەوەندەی تر چەند سەنگ و قـورسـایـی دەبەخشێت بەفەرهەنگ و شارستانیەتی ئێرانی، حافزیش چەندەها بیرمەنـد و فەیلەسوف باسی کردووە وەك گۆتە و ئیمەرسۆن و ئیدوار فینز جیرارد کە دەڵێت (حافز باشترین عازفی وشەیە).

دنیا بینی و تێڕوانینی حافز و مەحوی لەزۆر مەسەلەدا لەیەکتر دەچن هەرلەمەسە عیرفانیەکانەوە تا دەگاتە ئاستی بابەتە ئیمانی و عەقیدەیەکان، بۆیە دەمانەوێ بەکورتی پێش ئەوەی بچینەسەر تێڕوانینیان بۆ کارەکتەرە ئاینیەکان بەکورتی هەندێ لەو تێڕوانینە هاوبەشانەیان باس بکەین:

١.بابەتە عەقیدەییەکان: حافز و مەحوی باوەڕیان بەعەقیدەی جەبریەت بووە وپێیان وایە ئەوەی کەبەسەر مرۆڤدا دێت لەرۆژی یەکەمی دروستبونیەوە لەچارەی نوسراوە ئیتر نابێت لۆمەی کەس بکەیت و زۆرجار مەحوی و حافزیش ئەم مەسەلەی جەبریەتەیان بۆ بە (رەند) بوونی خۆیان هێناوەتەوە کاتێك ئەوان روودەکەنە مەیخانەی عیشق ئەوە لەرۆژی یەکەمەوە لەچارەنوسیان نوسراوە.(١)

ملامتم بەخرابی مکن کە مرشد عشق
حوالتم بەخرابات کرد روز نخست*

**شرح عرفانی غزلهای حافظ ل١٨٣**

واتە: لۆمە و سەرزەنشتی ئەوەی من مەکە، کەسەرخۆشم، چونکە رابەری عیشق لەرۆژی یەکەمەوە منی هەواڵەی خەرابات و مەیخانەکرد، یان لەبەشێکی تردا دەفەرموێ:

رضا بەدادە بدە وزجبین گرە بگشای
کەبرمن و تو در اختیار نگشادست

**دیوان حافظ قزوینی وغنی ل٣٧**

رازی بە بەوەی کەپێت دراوە و چرچ و لۆچی ناوچاوانت بڕەوێنــەوە، چونکە دەرگای هەڵبژاردن لەمن وتۆ نەکراوەتەوە بە هەمان بـیروبـاوەڕەوە مەحوی تەماشای ژیانی کردووە کە لەرۆژی دروستبونەوە (ئـەلـەسـت - الست) وە هەموو روداوەکان براوەتەوە:

چاری قـــەدەر بزانە نیە، چـــەندە چاری وا
بێ چارە ما کەبوبە دوو پەنجەی قەزادوچار
لەم کاروبــــــاری چارە یەکێ چارە گرژئەکا
واتێ گەیشتــووە کە هەر ئەسبابەدێ بەکار

**د م ٦٣٢ا**

٢. حافز و مەحوی ئەزمونی عیرفانیان ئەزمونێکی کـەسـیـەتـی خۆیانە، حافز بەوە ناسراوە کە پیرێکی مەعنەوی نەبووە تـەنـهـا (پـیری مغان) ی کردووە بەپیری خۆی و قەناعەتیشی بەوە هەبووە کـە دەبـێـت لەبڕینی رێگای عیشق و عیرفاندا هەموو کەسێك پیرێکی هەبێت، بـەلاّم لەسەردەمی خۆیدا کەسی بەشایستە نەزانیوە لەنێو پیرەکانی ئەو زەمـان ومەکانە بکات بەپیری خۆی، بەڵکو کە پیرێکی نەبووە رەفزی بونی پیر و هەمرایەکی وەکو خزر بۆ موسا ئاکات بەپێویستی بڕینی رێگاکە دەزانـێ و پێی وابووە رێگاکە ترسناکە و ئەم رێگایە بەتاریکیدا دەڕوات و دەبێـت ئەو تاریکستانە ببڕێ، بۆیە پێویستی بەرێبەرێك هەیە.

قطع این مرحله بی همراهی خضرمکن
ظلمات اســـت بترس از خطر گمراهی

بڕینی ئەم قۆناغە بەبێ هاودەمی و هـاوڕێـیـەتـی (خضـر) کـە ئاماژەیە بەپیری تەریقەت مەکە، ڕێگاکە تاریك و ترسی ڕێگاونکـردن و وێڵبون هەیە، بەلاَم وەك ئاماژەمان پێکرد لەسەردەمی خۆیدا کەسی بـە شایستە نەبینیوە بیکات بەرێبەری خۆی، هەروەك دەربارەی پـیرەکـانـی سەردەمی خۆی دەڵێ:

نیشان مرد خدا عاشقیسـت باخود دار
که در مشایخ شهر این نیشان نمی بینم

نیشانەی پیاوی خوایی عاشقیە وریابە، کەمن ئـەم نـیـشـانـەیـە لەپیرەکانی شاردا (مەبەستی شاری شیرازە) نابینم، لەبەرئەوە لەپیرەکانـی سەردەمی یاخی دەبێت و دەبێت بەرەند و پابەند نابێت بەپێوەرە بـاو و ڕواڵەتیەکانی کۆمەڵگاوە و پیری موغان دەبێت بەپیری ڕێگای مەتـرسـی عەشقەکەی هەروەك ئەڵێ :

گر پیرمغان مرشــــد من شد چ تفاوت
در هیچ سری نیست کەسری زخدانیست

د ح ٦٩٧

گەر پیری موغان بووە پیری من چ جیاوازی هەیە چونکە سەرێکی مرۆڤ نیە کەنهێنی خودای تێدا نەبێت.

ئەڵبەتە حافز بەیتگەلێکی زۆری هەیە هەم لەسەر ئەوەی دەبێت لەرێگای عیشقدا دەلیل و رابەرت هەبێت، هەم لەسەر ئەوەی کە تەنها پیری موغانە پیری ئەو کە هیچ کەموکوڕییەکی نییە و دەتوانرێت بکرێت بەهاوکاری رێگای عیشق.

مەحویش وەك لەپێشەوە باسمانکرد بەئاشکرا وەك عورفێکی بنەماڵەکەیان بووە بەموریدی شێخ بەهائودینی کوڕی شێخ عوسمانی تەوێڵە، بەلاّم لە شیعرەکانیدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مەحوی ئەو پیرەی دەسگیر نەبووە بتوانێت بەرێگای پڕ مەترسی و تاریکیدا بیبات و بیگەیەنێتە نێوی عالەمی عیشق، هەروەك دەڵێ :

چبکەم، نەئەو کەسەم کە کەسم بێ لەلابەکەس(٢)

خۆشم نەگەیمە ئەو کەسە ئەو مــن بکا بەکەس

**د م لا**

مەحویش هەرپیری موغان پیری راستەقینەی بووە و لەناخەوە ئەوی هەڵبژاردووە، هەروەك مەحوی دەڵێ : پیری موغان سوێندی داوە کە لەمەولا تەنها موریدی پیری موغان بێت و قسە و ئامۆژگاری کەسیتر وەرنەگرێ.

قەسەمی گوێمی بەچاوی بەچەدا پیری موغان

کەلەمـــەولا نەیبێ وەعـظ و قســەی مەولانا

**د م ٣٤٧**

بەڵام مەحوی تەنها بەئیشارە نەبێ زۆر بەروونی هەندێ مەسەلـەی باس نەکردووە هەروەك لەباسی مەنسوری حەلاجدا باسی رازەکانی خـۆی دەکات کەی پیشانی کەسی نادات و دەڵێ :

حەق بێژی یەك گوناهیە مەنصور و حەقمە من
ئەم قطعە گەر نیشانی نەدەم (مەحوی) بەکەس

**د م ل١٤٩**

بۆیە بەئاشکرا پیرە رەسمی وزاهیریەکەی قبوڵ بووە، بەڵام لەناخەوە پیری موغانی کردووە بەپیری بڕینی رێگای عیشق.

٣.حافز و مەحوی هەردووکیان بەگژ ئەو کارەکتەرە ئـایـنـیـانـەدا چونەتەوە کە رواڵپەرست و بەرژەوەندیخوازبـوون و بـازاڕی ریـاکـاریـان گەرمکردووە و خۆیان هەڵواسیوە بەفیتراکی دەسەڵاتدا.
مەحوی دەفەرموێ :

مـەتاعی صیدق و اخلاصم لەبازاڕی ریاکاران
لەسورەی (قل هو الله) دەکەم لەموشریکستانە

**د م ل٢٨٧**

هەروەها حافز تەوبە لەوزوهدە ریاپەرستیە دەکات کە لەهەناویـدا ریاکاری خۆی مەڵاسداوە و دەیەوێت بەنـاوی زوهـدەوە بـەرژەوەنـدیـتر بەدەستبهێنێ.

بشارت بربەکوی می فروشان

که حافز توبه از زهد ریاکرد

**د ح لا۱۳۱**

واتە: مژدە بۆ کۆلآنی مەیفرۆشان کە حافز لەزوهدی ریا تەوبەی کرد.

ئێمە لەم باسەماندا تەنها لەسەر ئەو کارەکتەرە ئاینیەی زاهید قسەدەکەین و بەراورد لەنێوان مەحوی و حافزدا دەکەین کە لەشیعری هەردوو شاعیردا بەشێوەیەکی نێگەتیڤ و خراپ هاتووە و هەردوو شاعیر هەوڵیانداوە کە پەردە لەسەر حەقیقەتی ئەو کەسانە هەڵدنەوە و ئەوەی نادیارە بەشیعر و غەزەلەکانیان لە بەرچاوی خەڵکێك بەفریشتە لەو کەسانە گەیشتون بیکەن بە دیار. ئەو توێژە ئاینیەی کە مەحوی و حافز توانجیان لێدەگرن، ئەوانەن کە ئەو سیفەتە ئاینیانەیان داوەتە پاڵ خۆیان و بەرواڵەت لەوتوێژەن، ئەگینا مەبەستی حافز و مەحوی هێرش و پەلاماردانی حەقیقەتی ئەو کەسانە نیە کە بەراستی ئەو رێگایان گرتۆتەبەر، ئەوانەی ئەوا بە خراپ باسیان دەکەن (سۆفی، زاهد، واعظ) ئەمانە لەزۆربەی شیعرەکانی حافز و مەحویدا بەخراپ باسکراون ئەگەرچی لەچەند بەیتێکی زۆرکەمدا هەندێ جار بەباش باسکراون کە دیارە مەبەستیان (سۆفی) راستەقینەبووە، بەلآم حافز و مەحوی هەمیشە (عارف و دەروێش و رەند) بەباشی باسیانکراوە لەشیعرەکانیان کە خوا یار بێت ئێمە هەوڵدەدەین لەنوسینێکی تردا بەراوردێکیش بنوسین لەسەر ئەوسێ کارەکتەرە.

**زاهید**

زاهید لەشیعری هەردوو شاعیردا بە شێوازێکی نێگەتیڤ وێناکراوە و هەمیشە زاهید وەك (رەقیب) تەماشاکراوە و لەلایەن عاشقانە داوای لێدەکرێت کەوازبهێنێ لەو ئەتوارە خراپانەی کە دەبێتە مایەی تێکدانی حاڵەتی روناکبونەوەی عارفان.

پێویستە لەسەرەتاوە لەوشەی زوهد تێبگەین و بزانن چ مانایەك دەبەخشێ و چەمکە ئاینیەکەی بۆ کێ بەکارهێنراوە و ئایا تێڕوانینی دین چیە بۆ زوهد و زاهیدەکان؟

**زهد:** یەکێکە لەمەقامەکانی تەریقەت کەدوای مەقامی ئەوبەو وەرع دێت بەواتای روو وەرگێڕان و پشتکردنە دونیا و خۆشیەکانیەتی، واتە زاهید بەقۆناغەکانی بڕینی مەقامەکانی تەریقەتدا دەڕوات، واتە زوهد ئەوەیە کە شتە حەلاڵەکان لەخۆشیەکانی دونیا هەمووی بۆی بڕەخسێ، بەلاّم کەسی زاهید وازی لێ بێنێ بۆ شتێکی باشتر، کە بەرزبونەوەیە بۆ پلە بالاّکانی عیرفان، هەندێك لەعاریفەکان پێناسی زوهد بەوە دەکەن (کە نەهێشتنی دونیایە لەدڵدا نەك لەدەستدا) الرسالە القشیریە ص٦٥ و ئیمامی مەناوی دەفەرموێ : (زوهد وازهێنانی تەواو و کۆتایی نیە لەدونیا بەڵکو بون و نەبونی وەك یەك وابێ لەلات) فیض القدیر شرح الجامع الصیغ ج ٤ صـ٧٢ و عەبدول قادری گەیلانی دەفەرموێ : (زهد دەرکردنی دونیایە لەڵداو دانانیەتی لە دەستدا یان لە باخەڵدا).

کەواتە : زوهد قسەیەك نیە بەدەم بگوترێت یان باسێك لەمینبەر و کۆڕ و کۆبونەوەی گشتیدا پێشکەش بکرێت بەڵکو کردارە و دەرکەوتەی هەیە لەژیانی زاهیدەکاندا هەربۆیە لەفەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) هاتووە دەفەرموێ (قوم یقولون قول الانبیاء و یعملون عمل الجبارة)[٣] کۆمەڵێ خەڵك هەن گوفتاریانگوفتاری پێغەمبەرەکانە و رەفتاریان رەفتاری ستەمکارەکانە، و بە یەحیای کوری مەعاز دەفەرموێ : نیشانەی زوهد سیانە: کرداری بێ پەیوەندی و گوفتاری بێ مەبەست و تەماع و شکۆمەندیەکی بێ ویستی سەرکردەی.[٤]

ئەگەر ئێمە بەوردی ژیاننامەو شیعرەکانی مەحوی و حافز بخوێنینەوە بۆمان رون دەبێتەوە کەتوانیویانە ئەو مەقامە ببڕن و بگەنە پلە بالاکانی عیرفان و شێوازی ژیان و گوزەران و پەیوەندیان بەڵگەن لەسەر ئەو زوهدەی کە لەلایەن ئاینەکان و عاریفەکانەوە ویستراوە و ستایش کراوە، بەلاّم ئەو زاهیدانەی کەمەحوی و حافز بەشێوازێکی نێگەتیف باسی دەکەن زاهیدێکی روکار پەرستەو کەسێکە خۆ بەزاهید زانە (متزهد) واتە زاهیدێکە بەگوفتار و ستەمکارێکی ئاینیە بە رەفتار، زاهیدێکی زوهد فرۆشە و دەیەوێت بەم ئیدیعایەی مەقامی کۆمەلاّیەتی پێ بەرزبکاتەوە بەوەی هەمیشە دەم لەزوهد و خواپەرستی دەکوتێ و باسی شکۆمەندی نەفس دەکات، بەلاّم لەناخەوە ئامانجی ئەوەیە خەڵك بیکەن بەروگەی خۆیان و لەدەوری کۆببنەوە.

**

## وێنەی نێگەتیڤی زاهید لای مەحوی

مەحوی زاهیدی شوبهاندەوە بەژنێکی پیری عەیار کە لاسایی ژنێکی جوان بکاتەوە و کاتێك نازو عیشوە دەکات کە ئیشارەت بکات بۆ هەرکەسێ بۆ لای خۆی رای دەکێشێ، بەلاّم کە پیرەژنێکی ناشیرین ئەم نازو عیشوەیە دەکات زۆر ناشیرینە و کەسیش ناچێت بەلایەوە، بەلّکو دەبێتە جێگای توانج و تانە، پیرەزاهیدیش بەهەمان شێوە پیرە بە مانا زەمەنیەکەی، واتە لەتەمەندا پیرە، بەلاّم پیری تەریقەت و عەشق نیە و خۆی بەپیر زاهد ورابەری تەریقەت دەزانێ، بەڵکو رێگای عەشقی ونکردووە، کاتێکیش بانگی خەڵك دەکات بۆ تەریقەتەکەی دەبێتە جێگای تانەو توانجی خەلکی، چونکە ئەهلی تەریقەت نیە و خۆی پیاهەڵواسیوە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانی و دەیەوێت بەتەریقەتەکەیشی پەردەپۆشی بکات، بەلاّم بۆی نالوێ هەروەکو چۆن ناشیرینی و پیری ژنە پیرەکە ناشارێتەوە بۆی و نازوعیشوەکردنەکەی لەبری ئەوەی نازداری بکات ناشیرینتری دەکات.

بەپێچی خواروخێچ ئیما دەکا پیری تەریقەت، بێ
حەقیقەت پیرە زاهید پیرە، گومکردوی طەریق ئەمما

**د م لا ٣١**

لەبەشێکی تردا مەحوی داوا لەپیرە زاهید دەکات کەتۆبە بکات لەریاو دوری، چونکە زاهید ئەوەی دەیکات بۆ رووپاماییە، لەناخی خۆیدا مرۆڤێکی پیس و لیخنە، واتە خواپەرستی و زوهدەکەی بۆ خوانیە،

بەڵکو بۆ ئەوەیە خەڵك بەخواپەرست و دونیانەویستی بناسن، ئەمەش بەپێی پێوانە ئاینیەکان هاوبەشی پەیداکردنە بۆ پەروەردگار هەروەك لەفەرمودەدا هاتووە (الرياء شرك)[٥] بۆیە مەحوی داوا لەزاهید دەکات و دەڵێ وەرە باپێکەوە تۆبەبکەین و بڕۆینە ناو جیهانی عەشقی راستەقینەی خوایی کە لەو جیهانەدا غەیری پەروەردگار کەسیتر نابینرێت و هەرچی بونی تریشە دەبێت بەوەهم، دیارە تەوبەکردنی مەحوی لەگەڵ پیرە زاهید، تازەکردنەوەی تەوبەیە وەك لەفەرمودەدا هاتووە پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی (لان لاستغفر الله والتوب اليه في اليوم سبعين مرة)[٦] واتە لەشەو و رۆژێکدا حەفتاجار داوای لێخۆشبون و تەوبە دەکەم، بەلاّم تەوبە کردنی زاهید دەبێت تەوبە و وازهێنان بێت لە ریا.

نزیکە مردنت ئەی پیرە زاهید
وەرە باتۆبە بکەین، ئیتر ریا بەس

**د م ل١٤٥**

لەبەشێکی تردا مەحوی داوا دەکات لەزاهید کەروبکاتە بارەگای عیشق ئەو بارەگا و مەئوایەی کە زۆر گەورەیەو بەرفراوانە و تەنها بۆ ئەوان نیە کە تیایدا ماونەتەوە، ئەگەر تۆش پەشیمان بیتەوە وریگای عەشق بگرێت جێگای تۆش تیادا دەبێتەوە و تۆش دەبیت بەئەهلی دڵ.

زاهید وەرە روێ بکەرە بارەگای هی عیشق
عالی جەنابە، وانیە هەررێ بدا بەکەس

**د م ل١٤٨**

بەڵام زاهید روو ناکاتە بارەگای عیشق، بەڵکو بەرەو بەرژەوەندیەکانی خۆی رادەکات و ئەگەر مەحوی روحی دەرچوە بۆ باری گەنم رەنگ لەبەرامبەردا زاهید رۆحی بۆ پارویەك جۆ دەرچووە بەرەو کولێرە دەڕوات.

بۆ قورصی گەنم گونیە رۆحی چووە مەحوی
وەك زاهید و صوفی کە لەبۆ خەپلەی جۆ چون

**د م ل٢٤٥**

زوهد لای مەحوی بەمانای دونیا نەویستی و ژیانی مادی نەویستن دێت و گەڕان بەدوای خولیا بالاو نەمریەکانیدا دێت، لێرە زیاتر دەچێتە نێو سۆفیگەری و عیرفانی راستەقینە، لێرەوە لەژیان تێگەیشتووە، بۆیە دەیەوێت بەرەوخولیا بالاو نەمرەکان بڕوات بۆیە مەحوی دەڵێت:

بەئاوی تێگەیشتن ئێمە دونیا هەرسەرابێ بوو
هەموو دەشچن بەخنکان و لەوشکیشە مەلەی مەخلوق

**د م ل١٨٢**

زاهید نەیتوانیوە قۆناغەکانی تەریقەت ببڕێ و بەرەو پلە بالاکانی عیرفان بڕوات و بگاتە حاڵەتی نەشئە و تامی مەی عیشقی نەکردووە، بۆیە وادەزانێ ئەوەی ئەو دەیچێژێ لەو ژیانە ئاساییەی ئەوە کۆتا قۆناغەکانی بڕینی پلەی عیشقە لەبەرئەوە زاهید زوهدەکەی کردووە

بەپیشە و پایەیەکی کۆمەلأیەتی ، وا دەزانیٚ ئەو دینە روکەشەش ئەو وەریگرتووە تەنها ئەوەیە دین، زاهید وەك کەسێك وایە هەر خواردنی نیسك بێت وادەزانیٚ لەنیسکێنە خۆشترنیە، بۆیە نامۆ و بێگانەیە بەتام و خۆشیەکانی تر، بەهەمان شێوە زاهیدیش نامۆ و بێگانەیە بەبۆن و تامی مەی میسکاوی[٧] کەبریتیە لەحاڵەتە روحیە بەرزەکەی عیشق.

مەئلوفە زەوقی زاهید ئە وەندە بە تامی نیسك

بێگانە ماوە شەممی لە نەشئەی خیتامی میسك

**د م لا١٨٨**

❊❊

## زاهید و باری مەحەببەت

لەتێڕوانینی مەحویدا هەمیشە زاهید کەسێکە ئیدیعای کـامـڵـی دەکات و خۆی بەشێوازێك نیشان دەدات باری قـورس خـۆشـەویسـتـی پەروەردگاری هەڵگرتووە، زاهید هەڵگری باری مەحەببەت کەمـەبـەسـت پێی ئایەتی (انا عرضنا الامانة علی السموات و الارض و الجبال فأبین ان یحملنها واشفقن منها وحملها الانسان انه کان ظلوماً جهولاً)[٨] کەبەپـێـی لێکدانەوەی عیرفانی پەروەردگار دەفەرموێ ئێمە (ئەمانەتی عیشـقـمـان دابەسەر ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکاندا نەیانتوانـی هـەڵـیـبـگـرن و بەزەییمان پێیاندا هاتەوە مرۆڤ شانی دایەژێر ئەو ئەمانەتە بەراستی مرۆڤ ستەمکار و نەزان بوو) وە لەفەرموودەیەکـی قـودسـیـدا هـاتـووە و دەفەرموێ (مایسعنی ارضی و لاسمائی ولکن یسعنی قلب عبدی المؤمـن) زەوی و ئاسمانەکەم نەیتوانی بمگرێتەخۆ، بەلاّم دڵی بەندەیەکـی بـاوەڕدار گرتمیە خۆ.

هەڵگری باری عیشق ئەگەر ئاسان بێتە بەرچاوی زاهید و ئیدعـای ئەوە بکات کە ئەو ئەمانەتەکەی هەڵگرتووە، ئەوە دیارە نەرۆشتۆتە نـاو عیشق و هەر لەدەرگاکەشی نەداوە و لەبەردەم ئەو ئاستانـەدا وەسـتـاوە بۆیە وائاسان دێتەبەرچاوی ئەگینا لەنێو دەریای بێ پەی عیشقدا مـەردی دەوێ بەرگەی بگرێت و هاواری لێ هەڵدەستێ هەروەك حـافـزی شـیرازی دەڵێ :

الایاایها الســـاقی ادر کــأســـاً ونـــاولها

که عشق آسان نمود اول ولی افتادمشکلها

**د ح لا١**

ئەی مەیگێڕ پێکێك تێکەو لەو پێکەش بدە من، چونکە لەسەرەتاوە عەشق بەئاسانی هاتەپێش چاوان، بەڵام پاشان گێژاو گرفت رویاندا.

لەبەر ئەوە زاهید دەمی هەڵکردووە و ئیدعای هەڵگری ئەو ئەمانەتە دەکات مەحویش رووی تێدەکات دەڵێ تۆ جلەکانی خۆتت بۆ هەڵناگیرێ و بووە بەبار بەسەرتەوە و وەك گای پیرت لێهاتووە ناتوانێ هیچ زەویەك بکێڵێ ئیتر باری مەحەببەتت جۆن بو هە ڵدەگیرێ:

لەباری باری مەحەببەت ئاسمان و ئەرز ئەناڵێنن

چیە ئەم دەعوییەت زاهید، جلی لێ بارە گا پیرەت

**د م لا٦٨**

ئەگەر زاهید بە زیکرو تەسبیحاتەکانیدا دەنازێ و دەڵێ بەجێهێنەری بەندایەتیم بەوەی دەستی بەتەزبیحەوەیە و دەمی بەزیکرەوە مەحوی لەبەشێکی تردا دەڵێ : بەڵێ پێدەچێ زیکر بەدەم بکەیت، بەلاّم کەدڵ خاڵی بوو لەعیشق هیچ سودێکی نیە تەنها دووبارەکردنەوەی وشەیەو هیچی تر.

بەخودا قەسەم لەگەڵ دڵی خاڵی لەسۆزی عیشق

تەکراری حەرفە بەس دەمی پڕ یاخودا خودا

**د م لا ٦**

**

## قسەو باسی زاهید

بەهۆی ئەم ویردو زیکرە لەفزیەوە زاهید خۆی لێگۆڕاوە و عوجب گرتویەتی و دوبارە زاهید هەمیشە باسی زیکرو نوێژو رۆژوەکەی دەکات و بە حسابی خۆی خەڵوەت دەکێشێ و بەو ریازەتکێشانە خۆی لەخەڵکیتر جیادەکاتەوە، بەڵام ئەم ریازەتکێشانە هیچ سودێکی نیە بۆ تۆ ئەی زاهید تەنها برسیەتی و تونیەتیت بۆ دەمێنێتەوە، چونکە عیبادەتەکەت سەری کێشاوە بۆ عوجب و خۆدانازین لەناختا، کەواتە ئەی زاهید تۆ کە ناخۆیی وناخۆیتەوە لەگەڵ مردواندا جیاوازیتان نیە، چونکە هەردووکتان ژیانی روحیتان لێ دابڕاوە.

دیارە زاهید بەهۆی کە عیبادەتی زاهیدیانە قسەشی گۆڕاوە و قسەو باسی لەعیرفان و خواناسی و بەرزبونەوەیە بۆ پلە بالاکانی عیشق و مەحویش دەڵێ کەتۆ قسەو باست لەعیرفان و بەرزبونەوەیە بۆ پلە بالاکانی عیشق دەبێ واز لەهەموو موجودات و موتەعەلیقاتێکی دونیای دون بهێنی، کەچی بەپێچەوانەوە ئامانجی راستەقینەت دونیا ویستیە و بەرژەوەندیخوازیە، تۆ باسی جەوهەر و ناوەڕۆکی شتەکان دەکەیت کەچی بەرواڵەت گیرت خواردووە و تیایدا قەتیس ماوی هەروەك مەحوی دەڵێ:

لەنان و ئاو ئەوا ئیمساکیە مردوش، ئەرێ زاهید
چ عوجبێکە، ئەمەندە دەنازی تۆ بەمورتاضی
قسەوباست لەعیرفانە، کەچی دنیایە مە نظورت
لە عینوانی جواهیر جوییانی و روو لە ئەعراضی

**د م ٣٥٧**

دیارە عوجب و لەخۆرازی بوون و خواپەرستی بۆ ئەوەی خەڵك وابزانن تۆ کەسێکی باش و خواپەرست و دوور لەبەرژەوەندیت، مرۆڤ والێدەکات ببێت بەدووکەسایەتی جیاواز، کەسایەتیەك بەزاهیری خوا پەرست ودونیا نەویستە و ئامانجی دونیایی و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی ناوێ و کەساتیەکی دی راستەقینە لەناوەوە هەروەك مەحوی دەڵێ لەجەوهەردا ئامانجی ئەو پلەوپایەو قسەی خەڵکەیە، بۆیە هەر بەپێی پێوانە ئاینیەکان هەموو عیبادەت و کردەوە باشەکان بەزاهیر وەرناگیرێ هەروەك لەقورئاندا هاتووە و دەفەرموێ (فلاتزکو انفسکم)[9]

واتە: خۆتان بەچاك مەزانن و خۆتان بەپاڵفتە مەزانن، وەك لەم فەرمودەدا هاتووە و دەفەرموێ : (ثلاث مهلکات شح مطاع و هوی متبع واعجاب المرء بنفسه) [10]

سێ شت مرۆڤ لەناو دەدات رەزیل و دەست نوقاویەك خاوەنەکەی کۆنترۆڵ کردبێ و دواکەوتنی هەواو هەوەسی خراپ و لەخۆ رازیبوونی کەسێك لەگوفتار ورەفتاری خۆی، بۆیە ئەم عوجب و لەخۆ رازیبونە هەروەك دەست نوێژ گرتنێك وایە کە بەهەوایەك بەتاڵ دەبێتەوە.

وەقتی هەموو کردووە هەر وچو ضایع
زاهید، بەبایەك ئەو هەموو سەعیەیشی چو ضایع
**د م لا٣٦١**

یان لەبەیتێکی تردا دەڵێ:

شــەطی ئاوی کەزاهید بۆ وچـویەك کردووە ضـــایع
فەقیرە، هەربەبایەك ئەو هەموو رەنجەی چووە ضایع
**د م لا ١٦٥**

زاهید خۆی بەئەهلی بەهەشتیان دادەنێ و لەدونیاشدا پلەوپـایـەی خۆی وەرگرتووە بەهۆی نزیکی لەسوڵتان و دەسەلاٌتداران و بەکارهێنـانـی ئاینەکەی بۆ مەرام و بەرژەوەندییە دونیاییەکەی، بۆیە دڵی ئـاسـودەیـەو ژیان خۆشەو لەدەسەلاٌتیشەوە نزیکە، مەحویش بێجگە لەکولبەی خەفەت هیچی تری نیە، بەلاٌم مەحوی سوپاسی خوادەکات لەفەقردایە، ئەڵبـەتـە فەقر مەقامێکە لەمەقامەکانی تەسەوف کەبریتیە لەو قۆناغەی کە دەبێ سالیك بیانبڕێ کەبریتیبوو لە (تەوبەو وەرع و زوهد و فەقـر و صـەبـرو تەوەکول و رەضا) مەحوی لەمەقامی فەقردایەو دورە لەئاستانـەی مـیرو سوڵتانەکان، چونکە نزیکبونەوە لەدەربارەی میروسوڵتانـەکـان دەبـێـتـە مایەی روو لەدنیاو و پلەوپایەی دەسەلاٌت، کە مایەی فیتنەیە بۆ کەســی عاریف و لەرێگای راستەقینـەی عـەشـق لایـدەدات، هـەروەك لـەم فەرمودەیەدا هاتووە (من اتی السلطان افتتن) ، بۆیە مـەحـویـش بـەو ئومێدەوە بەتەمایە بگاتە ئاوەدانی (بەقا) دوای ئەوەی لەخەرابات (فەنا) ی کردووە مەلاذی خۆی هەروەك مەحوی دەڵێ :

بەختە زاهید کە بەهەشتی بوەتە مەئوا، من
غەیری (بیت الحزن) ی دەردوجەفا نیمە مەلاذ
شوکری حەق بەردەری هەرفەقرە ئیقامەنگاهم
بەر دەروباری نە سوڵتان و نە شا نیمە مەلاذ
بەڵکە لەو ڕێیەوە من پەی بەمە عیمرانی بەقا
(مەحوی) غەیری خەراباتی فەنا نیمە مەلاذ

**د م ل١١٧**

کەزاهید خۆی بەخەڵکی بەهەشت دەزانێت و خەیاڵ ئاسودەیە، چونکە وادەزانێ بەو نوێژ و ڕۆژوە گەیشتۆتە مەبەستی خۆی کە خۆشبەختی دونیایە و بەدەستهێنانی بەهەشتە، دروستبونی ئەم حاڵەتە سایکۆلۆجیە لای زاهید دەرئەنجامی عوجب و لەخۆرازیبونە، کەوای لێکردووە خۆی لەخەڵکیتر بەباشتر و بەرزتر بزانێت، چونکە عوجب جۆرێکە لەنەخۆشی کە سەردەکێشێ بۆخۆ بەگەورەزانین (تکبر) بەسەر خەڵکیتردا لەدونیادا، واتە پەیوەندی کەسی زاهیدی خۆلێگۆڕاو لەخەڵکیدا پەیوەندیەکی کەسی بەرز و باڵایە بەکەسی نزم و بچوك و سادەو ئاساییەوە و لەرووی پەیوەندیش لەگەڵ خودادا ئەم عوجبە وای لێدەکات گوناهوتاوانەکانی خۆی نەبینێ و بەخۆیدا نەچێتەوە و زۆر تاوانی گەورە بکات و بەبچوکی بزانێ، هەر لەم تێڕوانینەوە زاهید هێرش دەکاتەسەر خەڵکیتر بە تایبەتی ڕێبوارانی ڕێگای عەشق و بەگومڕا و بە خەڵکی دور لەبەهەشتیان دەزانێ، بەڵام مەحوی دەڵێ مادام تۆخۆت بە بەهەشتی دەزانی و وا دەزانی بەهەشت تاپۆی تۆیە دەی ئێمەش ئەو

بەهەشتە کە لەدونیادا بۆ خۆت دروستکردووە و لەدوارۆژیشدا داتناوە خاوەنی بیت هەر بۆتۆ ئیتر دان لەگۆشتی ئێمە دەربهێنە و وازمان لێبێنە ئێمە هەرچین.

که ئێمە چونە جەننەتمان بە تۆدا

لە ئێمە لادە زاهید ئێمە هەرچین

**د م لا ٢٤٩**

دیارە ئەمەش دەریدەخات کە بەناو زاهیدەکان هێرشی توندیان کردووە سەر عاشقانی مەیخانەی عەشق و داوایان لێکردون لە مەیخانەکان بێنە دەرەوە چونکە رێگاو رێبازی عاشقانی حەقیقەت لە تێروانینی ئەواندا ناشەرعیە، چونکە رێگای خواپەرستی لای ئەوان هەر دەبێت لە خانەقاکانی ئەواندا بێت و دەبێت ئەوانیش بێنە سەر رێگای زوهدی وشکی زاهیدەکان، بەڵام مەحوی تەنها مەیخانە بەشوێن دەزانێ و دەرچون لەمەیخانە دەرچوونە بۆ ناشوێن و هیچ شوێنێکی تر نیە رووی تێبکەن.

لەمەیخانە، خودا ! گەر ئێمە دەرچین

بەکێ بەین ئیلتیجا، بۆ کیهە دەرچین

**د م لا ٤٨.**

**

## زاهید و پیری مەیخانە

بەلاّم مەحوی بانگی زاهید دەکات بۆ ئەوەی لەوجیهانە روکەشە دەرچێت و پێیەك هەڵبڕێ و بەرەو مەیخانەی عیشقی راستەقینە بێت و رێگای عەشق ئاچوخ وکراوەیەو دەرباری عەشق بەرزو بالاّیە وجێگای هەموو ئەو زاهیدانەیشی تیا دەبێتەوە کە نیەتی گەیشتن بە حەقیقەتیان هەیە هەروەك دەڵێ :

زاهید وەرە روێ بکەرە بارەگاهی عیشق
عالی جەنابە، وانیە هەر رێ بدا بەکەس

**د م لا ١٤٨**

یان لەبەیتێکی تردا دەڵێ :

نزیکە مردنت ئەی پیرە زاهید
وەرە بـــا تۆبەکەین ریا بەس

**د م لا١٤٥**

لەهەوڵی مەحوی بۆ ئەوەی زاهید بهێنێتە سەر رێگای عیشق و بیباتە مەیخانەی عیشق و پێکێکی لەو مەیخانە پێهەڵبدات تا بزانێت جیاوازی چیە لەنێوان زوهدی وشك و عیشقی راستەقینە، هەرچۆنێك بووە توانیویانە زاهید لەتەمەڵخانەو خانەقاکان دەربهێنن کە جێگایەکە تەنها بژێوی تیادا پەیدا دەکەن و بەرەو مەیخانەی عیشق بیبەن، بەلاّم پیری

مەیخانە ئامادە نەبوو پێکێك لە مەی عیشق بدات بەزاهید و وتـی مـن شەرابی سوری گوڵ رەنگ کە خوێنی جگەرە نادەم بەکەسی نەفام، چونکە کەسی نەفام شەرابەکە دەخوات و ناشیەتە سەر رێگای عیشـق،چـونـکـە ئەوانە نە دێنە سە ر رێگای راستەقینەی عیشق و نە خواش هیدایەتـیـان دەدات دیارە ئەمەش ئاماژەیە بە ئـایـەتـی (ان الله لایـهـدی الـقـوم الفاسقین).

بەدەفعی سیخنی کـردن لەزاهید راغیبی مـەی بو
کەچی ساقی وتی: نادەم بەکەم فام ئەز مەیی گوڵ فام
**د م لا٢١٥**

دیارە پیری مەیخانە باشتر زاهیدە روکەشـەکـان دەنـاسـێ بـۆیـە ئامادەنیە شەرابی عیشقیان بۆ فڕکات و دەزانێ هەرشەرابەکـە بـەزایـە دەدەن، چونکە ئەمانە تەنها بەبینینی نوری ناوچاوانی پـیری مـەیخـانـە هەموو داوە ساختەکاری و فڕوفێڵەکانی زاهید دەسوتێ وداوی فریوکاریان بەتاڵدەبێتەوە

لەچینی پەرچەما نوری جەبینی دی، وتی زاهید
کەسوتا دامی تەزویرم بەنوری دامی تـــەنویرت
**د م لا٦٧**

مەحوی لەبەشێکی تردا بەروونی باسی ئەوە دەکات زاهید بەباسی عیشق بێزارە و هەربەباسکردنی دەکەوێتە جوڵەیەك یان دەبێت هێرشب بکاتە سەر ساکینانی مەیخانە ,یان دەبێت هەڵبێت لە مەجلیسە، لێرەدا مەحوی زاهیدی بێزاری عیشقی چواندوە بەشەیتان کاتێك بەخوێندنی قورئان بێزار دەبێت و هەڵدێت لەشوێنەکەی کە قورئانی لێدەخوێنرێت.

وەك دێوی لەعنەتی کە کەلامی قەدیمی بیست

زاهید کە باسی عیشق ئەبیستێ دێتە جوڵەجوڵ

**د م لا ٢٠٧**

❊ ❊

## پەردە هەڵماڵین لەسەر رووی راستەقینەی زاهیدە روو کەشەکان

دوو رووی: مەحوی خۆ بەزاهیدزانەکان بەدوو روو دەداتە قەڵەم کە لە حوزوری خۆیدا ئاخ بۆ عاشقان هەڵدەکێشن و بە غیابی خۆیان زۆر خراپ دەمیان لێهەڵدەکەن ئەم خووە خراپە کە ریشە کەی دەگەڕێتەوە بو سیفاتی مونافیقینی مەدینە دژ بە پێغەمبەر ویاوەرانی مەحوی تورە دەکات و تا ئەوپەری ناشیرینکردن زاهیدی وەسفکردووە و بەسەگ شوبهاندویەتی ، ئە م شوبهاندنە لە زور شوێندا لەقورئاندا هاتووە وەك وەسفێك بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان بەستۆتەوە بە بەرژەوەندیە مایە کانەوە وتوند خۆیان پێوە بەستووە وخاڵیبونەتەوە لە بارە مەعنەویەکە بۆیە قورئان لە سورەتی ئەعرافدا لە باسی کەسێکدا کە حەقیقەتی پێگەیەنراوە بەلاّم ئەو لێی ها توّتە دەرەوە وتوند خۆی داکوتاوە بە بە رژەوەندیە کانەوە ودوای حەز و ئارەزووە کاتیەکانی کەوتووە قورئان بە سەگێگی دەشوبهێنی کە بە هۆ و بە بیّ هۆ هەمیشە لە هەناسە بڕکێدابێت [#]

لەئالێنی من ئیفتادە زاهید بۆ رقی هەستا

حوضوری ئاە ئاهی بو، بەغیبەت ئەو دەکا عەوعەو

**د م لا٢٦١**

ساختەچیەتی و فرِوفێڵ کەلەم فرِوفێڵ و ساختەکاریەدا لەگەڵ سۆفیدا لەکێبڕکێدان، بۆیە هەردووکیان بەفرِوفێڵ و ساختەکاری دەیانەوێ

بەرژەوەندیەکانیان مسۆگەربکەن، تائەو رادەیە زاهید و سۆفی دەبێت شەڕیان و مەحویش ئاواتە خوازە ئەم شەڕی ساختەکارو فڕوفێڵەکارانە ببێتە مایەی کۆتایی پێهاتنیان بۆ ئەوەی ڕێگای عیشق و ڕەندی ببێتە ڕێگای راستەقینەی گەیشتن بەخودا ئیتر بەناوی دین و زوهدەوە فڕوفێڵ لەخەڵك نەکەن.

زاهید و سۆفی بەشەڕهاتن لەسەر تەزویر و شەید
خێری ڕەندانە خوداکا بەرطەرەف بێ هەر تەرەف

**د م ل١٧٤**

بەلاّم لەدوو بەیتیتردا مەحوی گەورەیی دەبەخشێتە دەروێش[١١] و دەیکات بەشاهی بەحروبەڕ و زاهیدیش دەکات بەرەمزی فڕوفێڵ و دەیکات بەرێویێکی بودەڵە و بێ ئەرزش و کاریگەر لە مەیدانێکدا کە مەیدانی عیشقی ڕەندو دەروێشانە و ریشەکەشیان دەشوبهێنێ بەکەلکی رێوی و دەبێ بەدوای خۆیاندا رایکێشن

شوکر یار ئیزن دام هەم گریەکەم هەم قوربەسەرداکەم
بەجارێ شـــاهی من بەحروبەری بەخشی بەدەروێشێ

لەمێ مەیدانی عیشقە، کلکە رێویی ریشی تۆ زاهید
چ بێ قەدری ! دەبێ گەر شێری بێنێ کلکی راکێشێ

**د م ل٣٠٧**

لێرەدا مە حوی ئە جیاوازیە دەکات لە نیوان سوۆفی ودەروێش وزاهید، کەمەبەست لە زاهید زیاتر ئە و شیخانەی تەریقەتن وخۆیا ن بە سە قافڵەی تەریقەت دەزانن ودەبێت هەموو کەسێك لە رێگای ئە مانەوە بێتە سەر رێگای خواپەرستی وتەمەسوك لەوانەوە وەربگرێت.

نزمی نەفس و بەرژەوەندیخوازی : ئەگەر روحی مەحوی لەسەر لێوە بۆیاری گەنم رەنگ و بەئومێدە بگاتە ئەو حاڵەتە بەرزانەی عیشق کەیار جیلوە بکات و دونیا وشتە مادیەکانی تری لەلا دەبێت بەهیچ و هیچ موجودێکی تر نابینیٚ ، بێجگە لە جیلوەی جوانی حەق ، ئەوا زاهید و سۆفی بەپێچەوانەوە رۆحیان چووە دونیاو تێرکردنی ئارەزووە جەستەییەکانیان و مەحوی بەکولێرە جۆ ئاماژەی پێدەکات.

بۆ قورصی گەنم گونیە روحی چووە مەحوی
وەك زاهید و سۆفی کە لە بۆ خەپلەیی جۆ چون
**د م لا٢٤٥**

**

## حەقیقەتی زاهید

مەحوی هەر لەباسكردنی حەقیقەتی ناوەوەی ناخی خۆ بەزاهیدزانەكانەوە ناوەستیٚ هەروەك لەپێشەوە باسمانكرد، بەڵكو دێتە سەرباسكردنی شێواز و رواڵەتی دەرەوەشیان و بەشێوازێكی ناشیرین وەسفی دەرەوەیان دەكات، چونكە ئەوان دەیانەویٚ بەو رواڵەتە زاهیدیەی كەبۆ خۆیانیان دروستكردووە داوی فرِوفێڵەكانیان سەربگرێت ، بەوەی شێوازێكی خواپەرستی دەدەن بەخۆیان ، بەدانانی ریش و لەبەركردنی خیرقە، بەلاٚم كاتێكیش كەقسە دەكەن زۆر دوورن لەئەهلی دڵ و خەڵكی دونیانەویست ئەدوین و بیٚ ئەدەبانە ناوی خەڵكیتر دەهێنن، بۆیە مەحویش دوعایان لێدەكات.

زاهید چیە، هەیە گەبەڵی ریش و توكەسەر

ئاگر نەبیٚ، چی سەری دەركا لەجەنگەڵی

**د م لا ٣٠٨**

لەبەرئەوەی ریش و سەرەكەیان بۆ خوانیە وەك جەنگەڵێكی پر لە چر وجانەوەر وایە وریٚی لێدەرناكریٚ ، بۆیە هەر بۆ ئاگر تێبەردان باشە وهە ربەوەش چارەسەر دەكرێت ، لێرەدا بەروونی مەحوی رووبەروو دەبێتەوە لەگەڵ ئەو جۆرە دینداری ودەسەلاٚتداریەتیە ئایینیە كە ئاین بە كار دەهێنیٚ بو مەرامە نادینیەكە و تیٚروانینێكی شورشگێرانەی هەیە بو لەناو بردن وهەڵتەكاندنی ئە وجۆرە سیستەمە ،ئەگەچی تەریقەتی

نەقشبەندی خالیدی بەم رۆحە شۆڕشگێڕیە دەناسرێتەوە وەك لە راپەرین وشۆڕشە كانی شێخ عوبەیدوڵای نەهری و بارزانیەکان وعەبدولقادری جەزائیری و شێخ شامیلی داغستانیدا دەردەکەوێت کە هەموویان موریدی مەولانا خالید بوون ،بەلاّم ئەم گیانی شۆرشگێریە لە شێخانی هەوراماندا نابینرێ ، کە ئەوانیش باپیرە گەورەیان خەلیفەی مەولانا خالید بووە ،کە مەحوی خۆی وباوکیشی موریدی یە کێك لەو شێخانە بوون ،بەلاّم ئەو گیانی یاخیبون ورازینە بوونە بەو واقیعە سەپێنراوە جارێکیتر لە مەوحویدا سە ر هەڵدەدات ،ئە ڵبە پێشتریش ئاماژەمان بەوەدا کە مەحوی پیری موغانی کردووە بە پیری خۆی ئە گەر چی پیرێکی رەسمی وزاهیریشی هەبووە ،ئە م تێروانینەشمان پەیوەندی بە هەمان خاڵەوە هەیە بۆ خوێندنەوەی مەحوی.

لەبەیتێکی تردا مەحوی زۆر توند هێرش دەکاتە سەر زاهید بەوەی حەقیقەتی شتەکان نازانێ چونکە ئەگەر بیزانیایە پەلاماری ئەهلی عیشقی نەدەدا، چونکە دڵی ئەوانە بەعیشقەوە گیرساوەتەوە و زیندویەتی دڵی ئەوان بەو عیشقەوەیە.

زاهید، خودا لەناوی بەرێ، ناوی عاشقان
بۆچی دەبا ئەوەندە، خودایا، بەبێ ئەدەب
دڵ هەر بەداغی عیشقە، ئەگەر ئیمتیازی بێ
وەك نوقتەی ئینتیخابە لەسەر شیعری مونتەخەب

**د م ٤٧٧**

**

### زاهیدی رواڵەت پەرستی

مەحوی لە یەکێك لەجواترین بەیتە فارسیەکانیدا بە زاهیدی رواڵەتپەرست دەڵێت تۆ بەهەڵە تێنەگەی کە بەگۆڕینی دەرەوەت و بەرواڵەتکاری دەگەیت بەدیاری حەقیقەت، بەڵکو دەبێت ناوەوەت بگۆڕێت و ئاوەدانی بکەیتەوە بەعیشق، نەك بەلەبەرکردنی خیرقەو عەبای زبر و درکاوی وەکو ژیژك.

زجامه خشنت بوی عشق نی زاهید

چوخار پشت خودت در لباس خار مپیچ

**د م ٤٨٩٧**

لەجل وبەرگە زبرەکەت بۆی عیشق نایەت ئەی زاهید! ئیتر خۆت لەجلی دڕکاوی هەڵمەکێشە وەك ژیژك.

### وێنەی پۆزەتیڤی زاهید

لەسەرەتا باسمان لەو زوهدە راستەقینەیەکرد کە بەپێوانەکانی شەرع و هەم بە پێوانە عیرفانیەکە پەسەندە و مەقامێکیشە لەمەقامەکانی تەسەوف و دەبێت کەسی سالیك بیبڕێ بۆ ئەوەی بگاتە پلە بالاکانی ژیانی روحی و عیرفانی،و باسیشمان لەوەکرد زوهد گرنگ دان نیە بەرواڵەت و دیوی دەرەوە، بەڵکو گرنگیدانە بەناخ و دیوی ناوەوەی مرۆڤ و دەرکردنی بەرژەوەندی و هەوەسە نەخوازراوەکانە لەدڵدا و بەمانای وازهێنانێکی تەواو نیە لەدونیا بەڵکو بەمانای هێشتنەوەی دونیایە لەدەستداو دەرکردنیەتی لەدڵدا، چونکە شوێنی راستەقینەی

دونیا لەدەستدایە و لەناو شتە مادییەکاندایە، بەڵام دڵ و ڕۆحی مرۆڤ خۆراکی جیاوازە و دەبێت بەخۆراکی خۆی ئاسودە بکرێت، بۆیە مەحویش لە بەنێگەتیڤ باسکردنی زاهیدە روکەشەکان و بەرژەوەندیخوازەکاندامەبەستی ئەوانەن بەهەڵە و سەرەو خوار لەزوهد تێگەیشتون ، ئەگینا گەورەترین زاهیدی راستەقینە پێغەمبەرە (د.خ) بۆیە مەحوی بەپۆزەتیڤ باسی ئەو زوهدە دەکات لەقەسیدەی بەحری نوردا کاتێك لەستایشی پێغەمبەر (د.خ) باسی زوهدەکەی دەکات کەدەیتوانی هەموو خۆشیەکانی دونیا بەدەستبهێنێ و پلەو پایەشی گەیشتبوە عەرشی خودا، بەڵام بەکەم رازی بووە عولوی هیمەتی نزم نەبۆتەوە بۆ دەغاو دەنکە زیزانەی دونیا.

لەگەڵ ئەم ئیحتیشامە، زوهدی دنیایی تەماشاکە
کەیەك لەشانانی جۆ بۆ قوتی، یاخورما دوسێ دانە
فەلەك جاهێ سەری خەرمانی تاعەرش، ئەڵبەتە نابێ
تەنەززول کا عولووی هیممەتی بۆ دەنکە زیزانە

**د م لا–٤٢١**

❊❊

## زاهید لای حافز

زاهید لەشیعری حافزدا یەكێكە لەوكارەكتەرە ئاینیانەی كەزۆر بەناشیرین و بەنەفرەتكراوی باسكراوە، هەروەك چۆن وێنەی ناشیرینی پیشان دەدات لەسەر (واعیز و شێخ و فقیە و امام شهر و مفتی و صوفی خوری پۆش) بەهەمانشێوە زاهیدیش دەچێتە ریزی ئەو كارەكتەرە بێزراوانەوە، لەتێڕوانینی حافزەوە ئەمانە توێكڵی دەستیان بە توێكڵی ئاینەوە گرتووە و توێكڵ پەرست و زاهید پەرستن و وادەزانن بەپۆشینی خەرەقەو عەباو جبەو بەردانەوەی ریش و مانەوە لەخانەقاكاندا دەیانگەیەنێتە دوا پلەو پایەبەرزەكان، بەڵام ئەمانە هێشتا پێیان نەخستۆتە نێو جیهانی عیشقی راستەقینەوە، زاهید ئەگەر خۆی بەخواناس و تەقواپەرست نیشان دەدات، بەڵام حافز باس لەوە دەكات ئەوە رووی راستەقینەیان نیە، رووی راستەقینەیان ئەوەیە كە ئەوانە بەناوی تەقواو خواپەرستیەوە توشی خۆلێگۆڕان و خۆ بەگەورە زانین و ریاكاری بوون و خۆیان داناوە بەئەهلی بەهەشت و هێرش دەكەنەسەر عاشقانی دڵ و بەیاخی و دوور لەدین باسیان دەكەن، بەهەمان شێوە حافزیش زاهید بەنامەحرەم باسدەكات كە نابێت نهێنی و رازەكانی عیشقی لەلا باسبكرێت، چونكە تێی ناگات و بەپێچەوانەوە دەستدەكات بەپەلاماردانیان و بەدەرچوو لەدینیان دادەنێت.

پیش زاهد از رندی دم مزن کەنتوان کفت

باطبیب نامحرم حال درنهانی

لەبەردەم زاهیددا باسی رەندی مەکە، کەتۆ ناتوانیٚ حاڵی دەردی نهێنی خۆت بخەیتە بەردەم پزیشکی محرەم.

حافز جیلوەی پاکی خوایی لەکۆڕ و مەجلیسی زاهید و صوفی و دانیشتوانی مزگەوت و خانەقاکاندا نابینێت کە پڕن لەریاو رواڵەتی دونیا پەرستی، بۆیە لەشیعرێکدا ئەو نوری خودا لەکۆڕی رەنداندا دەبینێت کە بە (خرابات) ناوی دەبات، واتە ئەو جیلوەی خوایە لای خەڵکە پاك و دیوانە و دەروێشەکان دەبینیٚ کە دور لەهەموو رواڵەتێکی دینی و خیرقەو عەبای بەناو خواپەرستیان لەبەرنەکردووە و هیچ رەمزێکی دینیان دانەناوە بۆئەوەی بناسرێنەوە کە خواپەرستن بۆیە دەڵێت:

در خرابات مغان نورخدا می بینم

این عجب بین کە چەنوری زکجامی بینم

**د ح لا ٣٣٥**

لەمەیخانەو دێری موغاندا نور و روشنای خوا دەبینم ئەم شتە سەیرە ببینە کە روشنایی نورێکی وا گەورە لەشوێنێکی وادا دەبینم.

❊❊

## زوهد فرۆشان

حافز بێزاری خۆی لەبەرامبەر ئەوانەی لەوەرزی هەندێ لەعیبادەتە وەرزیەکاندا خۆیان دەرخستووە و دەمیان هەڵکردووە و قسەیان لەسەر عیبادەت کردووە و خۆیان بەسەر قافلەی ڕێگای خواپەرستی داناوە و ویستویانە خەڵك موعجەبی خواپەرستی و زوهدەکەی ئەوان بێت و ببن بەپێشەوا و ڕەمزی ئایینی، بۆیە حافز لەبەرامبەر ئەو زاهیدانەدا کەلەمانگی ڕەمەزاندا زوهدو عیبادەتیان بەخەڵك فرۆشتوە و ئەو مانگەیان داناوە بەهەل بۆ نمایشکردنی عیبادەتەکانیان و خواپەرستیەکی ڕواڵەتیانەدا وەستاوەتەوە و زاهیدەکانی بەرەزا گران ناوبردووە و لەبەرامبەردا ڕەندەکانی بەکەسانێك ناودەبات کە لەهەمووکاتێکدا لەگەرم و گوڕی عیشقدا دەژین.

نۆبەزهد فروشان گرانجان بگزشت

وقت رندی و طرب کردن رندان برجاست

**د ح لا ٢٠**

نۆرەی زوهدو فرۆشانی ئیسککگران تێپەڕی و کاتی ڕەندی و وشایی ڕەندان لەجێی خۆیەتی و ماوەتەوە.

بۆیە حافز ڕێگای بادەنوشانی عیشقی بەلاوە پەسەندبووە، چونکە دوورە لەریاو خودپەرستی و زوهد فروش.

بادەنوشی کە در او روی وریائی نبود

بهتر از زوهد فروش کە در او روی وراست

**د ح لا ٢٠**

مەینۆشێك کەریاکار و ساختەکار نەبێت چاکترە، لەزوهد فرۆشێك کەخەریکی ریاکاری و روکارییە.

## تەریقەتی عیشق و ڕەخنەی زاهید

حافز نەرمتر لەمەحوی قسەلەگەڵ زاهیداندا دەکات و بەگفتوگۆیەکی هێمنانە لەگەڵ زاهیداندا دەدوێ، ئەگەرچی مەحوی لەسەرەتاوە بەشێوازێکی هێمن گفتوگۆی لەگەڵ زاهیددا دەکرد، بەلاّم کەزانی ئەوان زۆرتوند پەلاماری ئەهلی دڵ دەدەن، بۆیە ئەویش زۆربەتوندی و بەکۆمەڵێ لێچواندنی ناشیرین و بەدوعاکردن بەلەناوبردنیان و بەوەسفکردنیان بەسەگ ناوی بردن، بەلاّم حافز قسە لەگەڵ زاهیددا دەکات و پێیان دەڵێ نابێ ئێوە ڕەخنە لەئێمە بگرن کە ئێمە ناتوانین واز لەشەربەتی عیشق و پێکی مەی بهێنین، چونکە عوزرمان هەیەو دەبێ ئێوەش بەمەعزورمان بزانن، چونکە هەریەکە لەئێمە دەبێ ئیلتزام بە زهدی خۆیەوە بکات و ئێمەش ئیلتزام بەمەزهەبی عیشقەوە دەکەین.

من نخواهم کرد ترك لعل یار و جام ومی
زاهدان معدور داریدم کە اینم مذهب است

من دەست لەلێوی یاروپێکی مەی هەڵناگرم، زاهیدان بەمەعزورم بزانن کەمن ئەمە دین و ڕێرەومە.

حافز پێی وایە عەشقی ئیلاهی ڕەحمەت و فەیزێکی خواییە درا بەهەرکەسێك ئەوە خێرێکی گەورەی پێدراوە، و گەیشتن بەعیشق بەکەسب و هەوڵ و ماندووبوون و خەڵوەتکێشان نیە، ئەو فەیزەیە ڕژا بەسەر هەرکەسێکدا لەخواوەیە، بۆیە ئەگەر زاهید لەقۆناغێکدا مابێتەوە

و نەگەیشتبێ بەعیشقی ئیلاهی و ئەو فەیزەی نەڕژابێ بەسەریدا عــوزری هەیە، چونکە لەدەسەلاتی خۆدایدانیە، بـۆیـە حـەقـیـەتـی لـەرەنـدی سەردەرناکا و لەحەقیقەتی رەندی تێناگا.

زاهـــد ار راه بــەرندی نبرد معذورست

عشق کاریست کە موقوف هدایت باشد

**د ح لا ١٥٨**

گەر زاهید ئاگای لەجیهانی رەندی نیە یان گەر زاهـیـد رێـگـای نەبردەسەر رەندی گوناهی نیەو عوزری هەیە، عیشق کارێکە پەیوەسـتـە بەهیدایەتەوە.

لەشوێنێکی تردا حافز جیاوازی دەکات لەنـێـوان شـەریـعـەت و تەریقەتدا و پێیوایە جیاوازی هەیە لەنێوان قسەی ئەهلی شەرع و قسـەی ئەهلی تەریقەت و عیرفان، بۆیە بە ئەهلی شەرع کـە زاهـیـدەکـانـیـش دەگرێتەوە دەڵێ تۆتێناگەی چونکە رێبازی تۆ و شێوازی لێکدانەوەی تۆبۆ قسەی ئەهلی دڵ لەروانگەیەکی زاهیر بینانەوەیە، لەکـاتـێـکـدا قـسـەی ئەهلی دڵ مانایەکی جیاوازی هەیە لەمانا زاهیریەکە، لەبەرئەوەی رێـبـاز و رێچکەتان جیاوازە، قسەکانمان بەهەڵە دەزانن، ئەگینا هەڵەنیە، بەڵکـو هەڵە لەوەدایە تۆ بەپێوەری خۆت قسەکانی ئەهلی دڵ لـێـکـدەدەیـتـەوە لەکاتێکدا دەبێت بەپێوەری خۆمان قسەکانمان لێکبدرێتەوە.

چو بشنوی سخن اهل دل مگو کە خطاسـت

سخن شناس نەای جان من خطا اینجا است

**د ح لا٢٢**

کاتێ گوێت لەقسەی ئەهلی دڵ دەبێت مەڵێ هەڵەیە، عەزیزم هەڵەکە لێرەدایە کەتۆ قسەناس نیت.

لەبەشێکی تردا حافز وەك بڵێی بەزاهید دەڵێ، کە ئەویش زەمانێك زاهیدێکی رواڵەتپۆش بووە، و خرقە و عەبای زوهدی لەبەردابووە، بەلاّم دواتر لەرێگای عەشقدا لەناویداوە، هەروەك خۆی دەڵێ هەرچیم هەبوو لە رێگای مەیخانەی عیشقدا دامنا، تەنانەت خیرقە و عەبای زوهد و تەقواش، واتە لەو سەرمایە رەمزیەی کە هەمبوو هیچم بۆ نەمایەوە کە بۆمەبەستی خۆمەستکردن لەرێگای بەدەستهێنانی شەرابی عیشقدا خیرقەی زوهدیشم لەدەستداو دام بەشەراب و پاشان لەدوای مەست بونم عەقڵیشم لەدەستدا، چونکە مرۆڤ کە مەست بوو عەقڵیشی نامێنێ، دیارە ئەوەش بەرۆشتنە ناو عیرفان و گەیشتن بەپلەی مەستی (سکر)، بەبڕینی هەموو مەقامەکانی تەسەوفە ، و هەرکەسێك بگاتە حاڵەتی مەستیەتی ئیتر ماڵی دونیای لەلادەبێت بەنامۆ و عەقڵیش لەو حاڵەتەدا دەستەوسانە، ئەڵبەتە لەدونیای عیرفاندا عەقڵ بەباشی باسنەکراوە وئەهلی عیرفان پێیان وایە ئەو حاڵەتانە بەعەقڵ دەرك ناکرێت و دەبێ عەقڵ بخرێتەلاوە بۆ ئەوەی بگەیتە پلە بالاکانی عیرفان و بەعەقڵکاری مرۆڤ لەناودەچێت و ناگاتە ئاستێکی رۆحی کە ئارامی و ئاسایشی پێ ببەخشێ.

خرقە زهد مرا آب خرابات ببرد

خانە عقل مرا آتش میخانە سبوخت

**د ح لا۱۷**

ئاوی خەرابات خەرقەی زوهدی برد و ئاگری مەیخانەش ماڵی عەقڵی منی سوتاند.

ئەڵبەتە عاشقانی ڕێگای حەقیقەت و عیرفان بەندایەتیان بەمەرج و ئامانجی روشتنە بەهەشت نیە، واتە عیرفانی عاریفەکان عیرفانێکی بەرژەوەندیخوازانە نیە، بەڵکو خواپەرستی عاشقانەی ئەوان هەروەك خۆیان دەڵێن لەبەرئەوەیە پەرسترا وشایستەی پەرستنە، ئەڵبەتە رابیعەی عەدەوی ناوبانگترین کەسەکە ئەو ڕێگایەی گرتووە و لەیەکێك لەشیعرەکانیدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| احبك حبين حب الهوى | وحب لانك اهل لذاكا |
| فا ماالذي هو حب الهوى | فشغلى بذكرك عمن سواك |
| واما الذي انت اهل له | فكشفك لى الحب حتى اراكا |
| فلا الحمد في ذا ولاذاك لي | ولكن لك الحمد في ذ وذاكا(١٢) |

خۆشم ئەوێیت دووجار خۆشم ئەوێیت، جارێك لەبەرئەوەی خۆشم ئەوێیت جارێکیش لەبەرئەوە شایستەی ئەوەیت ئەو خۆشەویستیەی بۆ خۆشەویسی بۆ ئەوەیە کەسەرقاڵبون بەیادت هەموو سەرقاڵیەکی تری لەکۆڵ کردومەتەوە ، ئەو خۆشەویستیەشی کەشایستەی ئەوەیت، بۆ ئەوەیە، کە پەردەت لەسەرخۆت بۆ من لاداوە تابتبینم، نە بۆ ئەوەیان و نەبۆ ئەمەیان من شایەنی سوپاس نیم، بەڵکو سوپاسگوزاری بۆ ئەمەیان و بۆ ئەوەشیان هەربۆ تۆیە.

کەواتە بەندایەتی عاریفان جیاوازە لەبەندایەتی زاهیـدانـێـك کـە لەقۆناغی زوهدا گیریان خواردووە و نەیانتوانیوە قۆناغە ببڕن و بپەڕینەوە بەرەو جیهانی عیشق و عیرفان ، هەربۆیە حافز بەو زاهیدانە دەڵێ :

تو بندگی چوگدایان بشرط مزد مکن

که دوست خود روش بنده پروری داند

**د ح لا ۱۷۷**

تۆ بەندایەتی وەك هەژاران بەمەرجی کرێ مەکە، چونکە یـارخـۆی بەندە پەروەری دەزانێت.

بەندایەتی عاشقان بەندایەتیەکە، کە بەندە دادەبڕێ بەغەیری خوا، و ئاگری عشق هەموو شتێکی تری لەبیری دەباتەوە و تەنها یەك روگـەی هەیە، ئەویش روکردنە روشنایی جەمالی خودایە هەورەك حافز دەڵێ :

در ازل پـرتو حـسنـت زتجلی دم زد

عشق پیداشد وآتش به همه عالم زد

**د ح لا ۱۵۲**

لەئەزەلەوە روناکی جوانیت کە جلیوەی کردو دەرکەوت، عـەشـق پەیدابوو ئاگری بەردایە هەموو جیهان.

لێرەدا بۆمان دەرکەوت کەشێوازی ئاخاوتنی حافز لەگەڵ زاهیداندا جیاوازە لەشێوازی ئاخاوتنی مەحوی، حافز بەزمانێکی نەرم و بەرزتر دەدوێ و ناکەوێتە نێو شێوازە شورشگێریەی کە مەحوی بەکاریهێناوە دژ بەزاهیدەکانی سەردەمی خۆی، پێدەچێ جیاوازیش هەبێت لەنێوان زاهیدەکان ئەو زەمان و مەکانەی مەحوی لەگەڵ حافزدا و ئەو ئەزموونە دەوڵەمەندو گەورەیەی ئێران زەمینیش رۆڵی هەبووە لە دروستکردنی شێوازی دەربڕینەکانی حافز لەمەحوی.

❊❊

**زاهید و پیری مەیخانە**

حافز وەکو مەحوی بانگی زاهید ناکات تۆبە بکـات و واز لـەو زوهدە وشکە وریاکارانە بهێنێ و پێی دەڵێ : وەرە مەیخانەی عیـشـق و هەوڵیش نادات پیری مەیخانە رازی بکات بۆ ئەوەی زاهیدیش وەربگـرێـت لە مەیخانەکەی و پێکی عەشقی بۆ تێکا، بەڵکو حافز بێزاری خـۆی لـەو جۆرە زوهدە وشکە دەردەبڕێ و بەندایەتی خۆی چەندبارە دەکـاتـەوە بـۆ پیری خەرابات، چونکە لوتف و مەرحەمەتی بەردەوامەو محرابی تیادانیە و هەمیشە نور و رۆشنایی لەو بادەیەوە وەردەگرێ ، کە پـیری مـەیخـانـە پێشکەشی دەکات، وە لەبەرامبەردا حافز رەفزی ئەوە دەکـات بـبـێـت بەموریدی شێخ و زاهید، چونکە ئەوانە ئەگەر مەرحەمەتێکیان هەبـێـت ساتێك هەیە یان نیە، واتە لوتف و مەرحەمەتیان والەحوکمی نەبوندا.

بنـده پیر خـرابتم کـه لطفـش دایـم اسـت
ورنه لطف شیخ وزاهد گاه هست و گاه نیست

**د ح لا ٧١**

بەندەی پیری مەیخانەم کەلوتفی بەردەوام و نەبڕاوەیە، ئەگەر لوتفی شێخ و زاهید جارێك هەیەو جارێك نیە.

حافز لەزۆر شوێندا ئەوە چەندبارە دەکاتەوە، کە مـوریـدی پـیری موغانە، چونکە ئەوەی شێخ و زاهید بەڵێنیان پێدابوو ، کە بەخشـیـنـی نور و روناکیە بەدڵی حافز ئەوان بەجییان نەهێنا وپیری موغان بـەجـێـی

هێنا، بۆیە وازی لەشێخ و زاهید هێناوە و بووە بەبەندەی پیری مـوغـان، چونکە پیری موغان مەرامەکەی بەجێ هێناوە، بۆیە لەبەیتێـکـی تـردا بەشێخ دەڵێ: ئەی شێخ مەرەنجە واز لەتۆ بهێنم و ببم بە موریـدی پـیری موغان و ئەوبکەم بەشێخی خۆم، چونکە ئەو وەعدەی تـۆ دات و ئـەو مەرامەی من ویستم تۆ بەجێت نەهێناو پیری موغان بەجێی هێنا.

مرید پیر مغانم زمن مرنج ای شیخ
چـرا کە وعدە تو کردی واو بجا اور

**د ح لا ١٤٥**

موریدی پیری موغانم ئەی شێخ لێم مەرەنجێ، چونکە تۆ بەڵێنـداو ئەو بەجێی هێنا.

حافز بەئومێدی ئەوەی مەرامەکەی شێخ و زاهید بیهێنـێـتـەدی، چووەتە خانەقای زاهیدان و خیرقەو عەبای زوهدی لەبەرکـردووە و بـووە بەموریدی ئەوان و ئەو سلوکەی گرتۆتەبەر کە ئەوان بۆ یان دیاریکردووە، بەلاّم ئەو ڕێگایە نەیگەیاند بەو مەرامەی کە ئەو ویستی، بـۆیـە وازی هێنا لەڕێگا و ڕێچکەی زاهید و شێخ و بووبە موریدی پیری مـوغـان و بڕیار دەدات کە خەرقەو جبەکەی بسوتێنێ، چونکە ئەم ڕواڵەت و ڕەمـزە زاهیدیانە نەیگەیانە مەرامی خۆی و تێگـەیشـت ئـەم ڕەزمـزانـە بـۆ بەدەستهێنانی پایەی کۆمەلاّیەتیەو چاو بەسکردنی خەڵکە و فڕوفێڵێـکـە بەناو زاهیدەکان بەکاری دەهێنن و ئەم ڕەمزانەش لای پـیری مـوغـان بەپێکێك لەمەی عیشق وەرناگیرێ و ڕێـگـای ڕەنـدی هـیـچ ڕەمـزو

عەلامەتێکی نیە،لێرەدا جورێك لە رەفزکردن ویاخیبون لە حافزدا بە دی دەکرێت کە رووبە رووبونەوەیە لە گەڵ مەرامی خراپ بەکارهێنانی دیندا.

من این دلق مرقع رابخواهم سوختن روزی

کەپیری می فروشانـش بەجامی برنمیگیرد

**د ح لا ١٥٩**

رۆژی من ئەم عەبارەنگاو رەنگە (مـەبـەسـتـی بـە چـەنـدەهـا پارچەرەنگاورەنگ پینەکراوە) دەسوتێنم، کەپیری مەیفرۆشان بەپێکـێـك نایەوێت.

حافز زاهید بەزمانلوس و فریودەر دادەنێ وپـێـی وایـە زاهـیـد بەزمانلوسی و ئیدعای کەشف و کەرامەت دەکات، جا بۆ ئەوەی حافزیش نەچێتە ریزی ئەوانەوە زوو خەرقەو جبەکەت دادەکەنێ و دەیخاتەلاوە. بـۆ ئەوەی گیان بەسەلامەتی دەرکات.

حافظ ایـــن خـرقه بینداز مگر جان ببری

کاتش از خرمن سالوس و کرامت برخاست

**د ح لا ٢١**

حافز ئەم عەبایە لەبەر داکەنـەو بـیـخـەلاوە، بـەڵـکـو گـیـان بەسەلامەتی دەرکەیت، چونکە ئاگر بەربۆتە خەرمـانـی فـریـوکـاری و کەرامەتەوە.

پاشان حافز ئەو زوهد و خەرقە پۆشانە بەریـا دەزانـی و ریـاش هاوبەشی دانانە بۆ مەعشوق کە لەفەرموودەدا بـە (شـیرك خـفـی – هاوبەش شاراوە) ناوی براوە، بۆیە حافز لەخانقاو موریدی شێخەوە دێـتـە

دەرەوە بەرەو مەیخانەی عیشقی حقیقی دەڕوات ، ئەمەش بەئاگا هاتنەوەی خۆی دەزانێ کە ئەوانەی ماونەتەوە لەناو خانەقاکەدا هێشتا لەغەفڵەتدا دەژین و ئەگەری بەئاگابێنەوە، ئەوا وەکو حافز بەرەو مەیخانە دەکەونەرێ.

حافز لەبەیتێکی تردا دەڵێ :

ز خانقاه به میخانه می رودحافظ

مگر ز مستی زهد ریا بهوش امد

**د ح لا ١٧٥**

حافز لە خانەقاوە بۆمەیخانە دەروات ، لە بەر ئەوەی لە مەستی ریا بە ئاگا هاتەوە.

حافز لە بەیتێکیتردا دەڵێ:

زهد گران کەشاهد و ساقی نمی خرند

در حلقه چمن بەنسیم بهار بخش

زوهدی گران کەیارو ساقی نایکڕن لەئەڵقەی گوڵزار و باخدا بدە بەنەسیمی بەهار.

حافز لای پیری مەیخانە دڵی ئاوی خواردوەتەوە و بەرگەی عیشقی خوایی گرتووە، بۆیە بەزاهید و خەڵوەتنیشنانی تری خانەقا دەڵێ : وەرنەدەرێ لەخەڵوەتگاکان و بڕۆن بەرەو دێرموغان لەوێ ئاوێك دەدەن کەدڵ بەهێز دەکات و دەتان گەیەننە یەقینی عیشق.

ای گـدای خـانقه برجه کـه در دیرمغان

می دهند آبی دلها را تو انگر می کنند

**د ح لا ١٩٩**

ئەی گەدای خانەقا هەستە کە لەدێری موغاندا ئاوێك پـێـشـكـەش دەكەن كە دڵەكان بەهێز دەكات.

هەرلەو دیری موغانە و لەلای پیری موغان گرفت و پرسە ئاڵۆزەكانی حافز كراوەتەوە و رزگاری بووە لەگرێ ی گومان و تـاریـكـی ئـیـدراكـی حەقیقەت، بۆیە دەڵێ :

مشکل خویش بر پیر مغان بردم دوش

کو به تأیید نظرحـــل معامی میکرد

**د ح لا ١٤٢**

دوێنێ شەو گرفتی خۆم بردە لای پیری موغان، هەر بەهێزی بـیـنـین (بصیرە) ی پشتەوەی شتە ئاڵۆزەكان و نادیارەكانی پشتی پـەردە گـرێـی گرفتەكانی كردەوە.

حافز كە باسی ئەو ئاوە دەكـات كـە لـە مـەیخـانـەی عـیـشـق دەیبەخشنەوەو دڵە كان بە هێز دەكات ، یان بەتـوانـای هـیـزی بـەسـیرە چارەسەركردنی موعەمای دەكات، مەبەستی رزگاربوونە لە و وەسـواسـی ودوو دڵیەی كە زۆر پیر وزاهیدەكان تێی كەوتوون و لە جیهانی مەعنەویتدا بە جیلوەی نوری حەقیقەت دەروێتەوە ، كە لەبەیتێكیتردا باسمانكـرد چـۆن حافز لە كاتی مەستیدا لە مەیخانە نوری خودای بینی وبەسەر سوڕمـانـەوە باسیدەكات،هەروەها رزگار بوونە لە دونیای پڕ ئیشـكـال وبـێـكـوتـایـی جەدەلیاتی عەقڵ.

## زاهید وباری مەحەببەت

حافز لەزۆر شوێندا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم ڕێگای عیشق و مەحەببەتەی ئەوان هەڵیان گرتووە هەر لەڕۆژی یەکەمەوە کراوە بە قەدەریان ،عیشق لەگەڵ ڕۆحی ئێمەدا شێلراوە و ئەم بەشەی کە بەئێمە دراوە لەعیشق لەڕۆژی (الست – ئەلەست) ەوە قبوڵمان کردووە وشانمان داوەتە ژێری، کەئەمەش ئاماژە بەئایەتی (واذا اخذ ربك من بني آدام من ظهورهم و ذريتهم واشهدهم على انفسهم الست بربكم قالوا بلى شهدنا) اعراف ئایەتی ١٠٧.

واتە : پەروەردەگارت پشتاوپشتی نەوەی ئادەمی کۆکردەوە (لەجیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لێوەرگرتن) و کردنی بەشایەت بەسەرخۆیانەوە و (پێی فەرموون) ئایا من پەروەردگاری ئێوەنیم؟! هەموو وتیان: نابێت تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ شایەتیمان داوە (کە تۆ پەروەردگارمانیت) ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لەڕۆژی قیامەتدا بڵێی بەراستی ئێمە لەمە بێئاگابووین؟!

بوونی جۆرە گرێبەستێکی بناغەیی، کە بەلای سۆفییانەوە ئەزەلییە، لەنێوان عاشق و مەعشوقدا، بەڵکو لەنێوان خالیق و مەخلوقدا، کە پێش هەمووشتێك دەکرێ ناوی پابەندیی ئەزەلی مرۆڤی بنرێ[١٣] ، بەلاّم لێرەدا حافز دەڵێ ئەی زاهید تۆ نازانی ئەم گرێبەستە ئەزەلیە هەیە لەنێوان ئێمەی عاشق و پەروەردگاری مەعشوقدا بۆیە ڕەخنەدەگری.

برو ای زاهد وبر دردکشان خرده مگیر

که نـدادند جـز این تحفه بماروز الست

**د ح لا ٢٦**

برۆ ئەی زاهید رەخنە لەبادەنۆشان مەگرە، چونکە لەیەکـەم  رۆژی خەلقەوە جگە لەم توحفە و دانسقەیە هیچیان بە ئێمە نەداوە.

لەبەیتێکی تردا حافز دەڵێ :

ملامتم بەخرابی مکن کەمرشد عشق

حـــوالتم به خـــرابات کرد روز نخست

**شرح عرفانی غزلهای حافظ / ج ١ لا١٨٦**

سەرزەنشتی ئەوە م مەکە سەرخۆشم ، چونکە  رابـەری  عـیـشـق لەرۆژی یەکەمەوە منی حەواڵەی مەیخانەکرد.

چونکە عەشق ئاگرێك بووە لە مەعشوقـەوە  بـەربـووە  گـیـانـی عاشقان، کە ئەمەش لەدەرکـەوتـن  و  تـەجـەلی  حـوسـن  و  جـوانـی مەعشوقەوەیەو ئەو بریقەی حوسنە بەرعاشقان کەوتەوە.

در ازل پـــرتو حسنت زجلی دم زد

عشق پیداشد و آتش برهم عالم زد

**د ح لا ١٥٢**

هەر لەئەزەلەوە رۆشنایی جوانیت کە جیلوەی کرد  و  دەرکـەوت، عەشق پەیدابوو ئاگری بەردرایە هەموو جیهان.

زاهید هەروەك پێشتریش باسمانکرد کەسایەتیەکی نێگەتیـڤـە لای حافز و کەسێکە زۆر بەخۆیدا دەنازێ و مەغرورە وبە خواپەرستی و زوهدە وشکەکەیدا دەنازێ، واخۆی پیشان دەدات کە پێویستی و نیازی نیـە و خاوە تێشوی پاشەرۆژی خۆیەتی ، و خۆی لەجوملـەی ئـەو کـەسانـە دادەنێت کە ئەمانەتی پەروەردگاریان هەڵگرتووە و توانیـویـەتـی بـاری تەکلیفێك هەڵگرێت کە ئاسمان و کێوەکان و زەوی نەیانتوانیوە هەڵیبگرن، بۆیە حافزیش دەڵێ : بەهۆی ئەو غرورو و بەخۆدا نازینە زاهید نەیتوانـی رێگای رزگاربوون بگرێتەبەر، بەپێچەوانەوە ئەوە رەندەکانـە کـەرێـگـای رزگاری و سەلامەتیان گرتەبەر بەرەو بەهەشت، کە دیـارە مـەبـەسـتـی لەرەند ئەو کەسانەیە کە دابڕاون لەدونیاو کۆمەڵگا و یەکلابونەتـەوە بـۆ خودا و هەمیشە زیاترپارانەوەیان زۆرە و خۆشیان بەکەم دەزانن:

زاهد عرور داشت سلامت نبرد راه

رند از ره نیاز بدار الســـــلام رفت

**د ح لا ٨٤**

زاهید مەغروربوو بەسەلامەتی رێگەی دەرنـەکـرد، بـەڵام رەنـد لەرێگەی خۆ بەکەمزانیدا و داواە چووە بەهەشت.

بۆیە حافز پێیوایە کە ئەوباری ئەمانەتە رەندان هەڵیانگـرتـووە و خۆیشی دەخاتە ریزی رەندانەوە لەئەزەلەوە ئەو فەیزەی پیێ بەخشراوە کـە خوا بێ نیازی کردووە کە خواپەرستیەکی ریاکارانەیە کـە زاهـیـدەکـان دەیکەن.

حافظ مکن ملامت رندان کەدرازل

مـــارا خـــدا ززهـــد ریا نیـــازکرد

**د ح لا ١٣٣**

حافز سەرزەنشتی رەندان مەکە، چونکە لەئەزەلەوە خوا ئـێـمـەی لەزوهدی ریا بێ نیاز کردووە.

حافز لەبەیتێکدا ئاماژە بەوە دەدات، کـەبـاری ئـەمـانـەت و مەحەببەت ئاسمان نەیتوانی هەڵیگرێ بۆیە ئەو ئەمانەتە تەنها دێوانـە و رەندەکان دەتوانن هەڵیگرن، ئەڵبەتە دێوانە و رەندەکانیش نەفی خـۆیـان دەکەن وبێجگە لەعیشقی ئیلاهی و حەقیقەت هیچ شتێکی تر نـانـاسـن بەپێچەوانەی زاهیدە رواڵەتپەرستەکانەوە، ئەڵـبـەتـە حـافـز خـۆیشـی دەخاتەریزی دێوانە و رەندەکانەوە.

آسمان بار أمانت نتوانست کشیدر

قرعەی کار بەنام من دیوانە زدند

**د ح لا ١٨٤**

ئاسمان نەیتوانی باری ئەمانەت راکێشێ بۆیە ناوی منی دێوانەیـان لەتیروپشکدا راکێشا.

❊❊

## پەردە هەڵماڵین لەسەر رووی راستەقینەی زاهید

حافز کارەکتەری زاهید بەکەسێك ناساندووە کە هەمیشە تێڕوانینێکی روکەشیانەی هەیە ، بەو مانایە تەنها توێکڵی دینی وەرگرتووە و نەرۆیشتۆتە ناو قولاًییەکانی ئاین و ئامانجە بەرز و گەورەکانی هاتنی دینەکان نازانێ و لە حەقیقەتی دینداری نەگەیشتووە، بۆیە ئەم دەستگرتنە بە توێکڵەوە رەنگدانەوەی نێگەتیڤیشی هەبووە لەسەر ئاکار و سلوك و رواڵەتی دەرەوە و ناوەوەی زاهید، بە گشتی زاهید لای حافز ئەم سیفەتانەی تیادایە.

- غورور و خۆ بەگەورەزانین.
- خۆ بەخوداپەرست دەرخەر و هەمیشە لەشوێنی خواپەرستیدایە.
- ریاکار و سست ئیمان.
- حەزی لەپلەو پایەی دونیایە.
- بێ وەفاو بێ پەیمانە.
- ئەهلی عیشق و حەقیقەت نییە (١٤)

حافز بەراوردێك لەنێوان ئاکاری زاهید و رەندانـدا بەشێوەیەك سیفاتی زاهید نیگەتیڤە و مایەی بێزارییە و دورکەوتنەوەیە لەعیشق و سیفاتی رەندیش پۆزەتیڤە و مایەی نزیکیە لەمەعشوق، زاهید عوجب گرتویەتی و بەخۆیدا دەنازێ و مەغرورە لەبەرئەوەی نوێژ دەکات، ئەڵبەتە نازانێ عوجب یەکێکە لەو سیفەتانەی کە خەرمانی عیبادەت و نوێژەکەی ئاگرتێبەر دەدات و دەیسوتێنێ و عوجیش هۆکاری دورکەوتنەوەی مرۆڤ

لەخواو یەکێك بوو لەو سیفەتانەی کە ئیبلیسی لەفەیز و رەحمەتی خوایی دوورخستەوە، هەر ئەم عوجبەش بوو وایکرد کۆمەڵێ لەسۆفیەکان کە هەڵسن بەئەنجامدانی کرداری خراپ و نەشیاو بۆ ئەوەی توشی عوجب و ریانەبن کە دواتر بە (مەلامەتیە) ناسران بەڵام سیفەتی (نیاز) داواکاری و کروزانەوە و بەردەوام داوای رەحمەت و فەیزی خوایی دەبێتە مایەی رژاندنی فەیزی خوایی بەسەر بەندەکانیدا کەجیلوەکردنی مەعشوقە لەحاڵەتی مەستیدا، کە حاڵەتێکە مەعشوق تیایدا روناك دەبێتەوە لەبەردەم کەسی عاشقدا.

زاهد و عجب و نماز ومن و مستی ونیاز
تـا تـرا خـود زمیان باکه عناین باشد

**د ح لا ١٥٨**

زاهید بەخۆدا نازین (لەخۆ رازیبوون) و نوێژ ومن و مەستی و دوعا و داواکاری تابزانین خۆت لەم نێوانە عینایەت و پشتگیری بۆ کامان بێ.

مەستی لەزماندا بەمانای بێ ئاگایی و بێ هۆشی دێت، بەڵام لەزاراوەی عیرفانیدا بەمانای حیرەت و سەرسورمانێك لەبینینی جوانی مەعشوقەوە دروست دەبێت، بەمانایەکی تر مەستی قوڵبونەوە و نوقم بوونی عاشقە لەعیشقی خۆشەویستیدا[١٥] کەواتە زاهد ئیلتزام بەنوێژێکی ریاکارانەوە دەکات و منیش نوقم بوم لە خۆشەویستی خودادا بابزانین عینایەت و پشتگیری بۆ کامانە یان لەبەیتێکی تردا حافز دەڵێ :

زاهد شراب کوثر و حافز پیاله خواست

تادر میانه خواستەکرد گار چیست

**د ح لا ٦٥**

زاهید شەرابی کەوسەر و حافز پیاڵەی خواست، تاببینین و لەم نێوەندەدا ویستی کردگارچیە؟

زاهید شەرابی هۆی خستە ئەو دونیاو ئومێدی بەشەرابی کەوسەرە، بەلاّم حافز هەر لەدونیا پیاڵەی شەرابی عیشقی هەڵگرت و دەیەوێت هەر لەدونیا مەستی عیشقی ئیلاهی هەبێت و خوداویست بێت و بەرژەوەندیخواز نەبێت وەك زاهید، پاشان حافز دەڵێ : ئەگەر ئەو بەئومێدی تەلار و باڵەخانەکانی بەهەشت و حۆریەکان خواپەرستی دەکات ئەوا ئێمە مەیخانەی عیشق تەلار و باڵەخانەکانمان یاری راستەقینەش حۆریمانە.

زاهد اگر به حور وقصور است امیدوار

مارا شرابخانه قصوراست ویار حور

**شرح عرفانی غزلهای حافظ ج ١ لا ١٧٠٣**

ئەگەر زاهید بە حۆری وقەسر وقسور ئومێدەوارە،ئەوا شەرابخانە قەسری ئێمەیەویاریش حۆریمانە.

لاهوری دەفەرموێ : عارفی شیرازی (مەبەستی حافزە) لەم بەیتەیدا دەمی لەبەرزترین پلەی عیرفان داوە، کە زوهدی عارفانەیە کە دەڵێ : ئەگەر زاهید بەرزترین و دوا ئامانجی بە دەستهێنان قەسر و قسوری بەهەشت و حۆریە ئەوا ئێمە بێجگە لەخودا و مەقامی عیشقی و خۆشەویستی ئیلاهی هیچ ئامانجێکی ترمان نیە.(١٦)

پاشان حافز باس لەرێگای رەندی دەکات، کەرێگایەکی سەخت و پڕ نشێوە و ناز پەروەرەکان ناتوانن بیبڕن.

ناز پرور و تنعم نبرد راه بەدوست

عاشقی شیوەی رندان بلاکش باشد

**د ح لا ١٥٩**

نازپەروەردەی نێو نازو نیعمەت ناگات بەدۆست، عاشقی بەشێوەی رەندانی زەحمەتکێش بە.

زاهید و شێخەکان بەناز پەروەردەکان کە هەمیشە نزیکی سەرای سوڵتانەکانن ناتوانن رێگای رەندی بگرنەبەر، چونکە رێگای رەندی رێگایەکی پڕ زەحمەت و بەڵایە.

لەبەیتێکی تردا حافز داوا لەرەند دەکات کە رێگای عەشق لەموحتەسیبەوە فێربن، موحتەسیب لەدەوڵەتی ئیسلامیدا مەئموری فرمان بەچاکە و بەرگری لەخراپە بووە بەتایبەتی لەشوێنە گشتیەکاندا، حافز لەبەیتێکدا لەلایەك تانە لەموحتەسیب دەدات بەوەی کە دەبێت لەهەمووکەسێك پاکتر بێت و دور لەحەرامەکان بێت و فرمان بەچاکە

بکات ، بەڵاّم ئەو خۆی بەدرۆ شەراب ئەخواتەوە و مەست دەبێت و کەس پێی نازانیٚ، کەچی لە شوێنە گشتیەکاندا رێگری لەخەڵك دەکات بخۆنەوە و یاسایان بەسەردا دەسەپێنیٚ ئەگەر حەرامێك بکەن، کەواتە ئەی رەند تۆش لەمحتەسیبەوە فێربە نەك لەزاهیدەوە کە رێگای عەشق و مەستیش دەبێت وەك محتەسیب شاراوەبێت و نهێنیەکانی عیرفان ئاشکرا نەکەیت و لەرواڵەتدا وەك زاهید دەرنەکەویت.

ای دل طریق رندی از محتسب بیاموز
مست است و درحق اوکس این گمان ندارد

**د ح لا ١٢٦**

ئەی دڵ رێگەی رەندی لە محتەسیبەوە فێربە، مەستەو کەس دەربارەی ئەو هیچ ئەم گومانەش نابات.

ئەم سیفەتەش وادەکات کە زاهید ئاگای لەحاڵی رەندان نەبێت، چونکە ئەو روکار پەرستە و هەرچیش لەسەر رەندان بڵێت مایەی رەنجاندن نیە.

زاهد ظاهر پرست ازحال ما آگاه نیست
درحق ماهرچە گوید جای هیچ اکراه نیست

**د ح لا ٧١**

زاهدی روکارپەرست ئاگاداری حاڵی ئێمە نیە، سەبارەت بەئێمە هەرچی بڵێت جێگەی رەنجانێك نییە.

ئەگەر زوهد بەمانای وازهێنان بێت لەدونیا بۆ قیامەت ئەوا حافز دەڵێ : من پیاوی زوهد وتۆبەو (طامات)و قسەیەك خەڵکی پێ فریو بدەی نیم، بۆیە بەپیاڵەی بادەی ساف لەگەڵ من بدوێ، لێرەدا لاهوری دەڵێ : مەبەستی حافز ئەوەیە، ئەگەر زاهیدەکان بۆ بەرژەوەندی قیامەت و بەهەشت واز لەدونیا دەهێنن و تۆبە دەکەن و قسەی هەلەق و مەلەق دەکەن بۆ ئەوەی خەڵك بەدۆستی خوایان بزانن، ئەوا من واز لەدونیا و قیامەتیش ئەهێنم و هیچیان ناگۆڕمەوە بەعیشقی ئیلاهی و تۆبەش قەت ناکەم لەشەرابی خۆشەویستی ئیلاهی، بۆیە ئێمە زمانی عیشق دەزانین و زمانی بەرژەوەندیخوازی نازانین و بەو زمانەش لەگەڵ ئێمە بدوێن.

مامرد زهد وتوبه وطامات نیستم

بامـا بجام باده صـافی خطاب کن

**د ح لا ٣٩٦**

ئێمە پیاوی زوهد و تۆبەو تامات نین پیاڵەی بەبادەی ساف لەگەڵ ئێمە بدوێن.

چونکە حافز پێیوایە ئەو زوهدەی رواڵەتیە کارێکی مەجازیە و حەقیقەتی نیە و لەپێناو بەرژەوەندیدایە، وە لەرۆژی دوایشدا هەرکەس کارەکەی مجازی بێت شەرمەزار دەبێت.

فردا که پیشگاه حقیقت شود پدید

شـرمنده رهروی که عمل برمجازکرد

**د ح لا ١٣٣**

سبەینێ کە سەرەتای حەقیقەت دەردەکـەوێـت ئـەو رێـبـوارەی کەکاری مەجازی بوو شەرمەندە دەبی.

ئەمەش ئاماژە بەئایەتی (یوم تبلی السرائر)[١٧] لەرۆژێکدا کەشتە شاراوە و نهێنیەکان پەردەی لەسەر لادەبرێ، بۆیە دواتر حـافـز بـەخـۆی دەڵێ و مەبەستیشی زاهیدە کە کاری حەقیقی عیشقی ئیلاهییە:

کار صواب باده پرستی است حافظا

برخیز و عـزم جزم بکار صـــواب کن

**د ح لا ٣٩٦**

کاری راست و دروست بە عیشقە پەرستنە حافز هەستەو بڕیاربدەو رووبکەرەکاری راست و دروست.

هەر لەباسی دەرخستنی حەقیقەتی زاهیدە لۆمەکەرەکـان حـافـز باسی پەیمانشکاندنی زاهید دەکات، کە پەیمان لەگـەڵ خـودای خـۆیـدا شکاندووە و کەسێکی پەیمانشکێنە، بۆیە حافز زاهیدی مەغرورو ریاکار و خۆبەوەلی خودا ئاگادار دەکاتەوە کە ئامان لەباری غیرەتی مەعشوق بـێ خەم مەبە، چونکە رەنگە لەهەرئان وساتێکدا لـەئـیـمـان دەرچـیـت و دەرچونیش لەئیمان ئەوەندە نابات.

زاهـــدا ایمن مـشو از بـــازی غیرت زنـــهار

کەره از صومعه تا دیر مغان این همه نیست

**د ح لا ٧٤**

زاهید، لەباری غیرەت بێ خەم مەبە ئـامـان!! چـونـکـە ڕێـگـە لەعیبادە تکاوە تا دێری موغان ئەوەندەنیە.

❊❊

## زاهیدی ڕواڵەتپەرست

حافز زاهید بەڕواڵەتپەرست دادەنێ ئەڵبەتە زاهیدی ڕواڵەتپەرسـت جیاوازە لە زوهدێکی عیرفانی، چونکە زاهیدی ڕواڵەتپەرست کەسێکە کە واز لەدونیا دەهێنێ لە بۆبەدەستهێنانی دونیا (ترك الدنيا للدنـيـا) واتـە ئەوکەسەیە کە بەزاهیر وازی لەدونیا هێنا و خەرقە و جـبـەی زوهـدی لەبەرکردووە و خواپەرستیەکی ریـا بـازانـە دەکـات بـەمـەبـەسـتـی چاوبەستکردن و ڕاکێشانی خەڵك نەزان بەلای خـۆیـدا، واتـە زاهـیـدی ڕواڵەتپەرست ناخی وێرانەو دەرەوەی جـوان و فـریـودەر و وێـرانـە، بەپێچەوانەی مەلامەتگەرەکانەوە کەلەپێناسەیدا هاتووە ،مەلامەتگەر : ئەو کەسەیە کە هیچ چاکەیەکی خۆی دەرناخات و هیچ خراپەیـەکـیـشـی ناشارێتەوە ، حافزیش دەڵێ:

زاهـد ظاهـر پرسـت از حـال ما آگاه نیست

درحق ما هرچه گوید جای هیچ اکراه نیست

**د ح لا ٧١**

زاهیدی ڕواڵەتپەرست ئاگاداری حاڵی ئێمە نیە، سەبارەت بەئێمە هەرچـی بڵێت جێگەی هیچ لۆمەیەك نییە.

ڕێگای عیشق ڕێگای گەیشتنە بەمەعشوق و دوا مەرامی لە عیشقیش عاشقیش گەیشتنە بەمەعشوقی حەقیقی، بەپێچەوانەی بەناو زاهیدەکان کە ئامانج لەزوهدەکەیان گەیشتنە بە بەرژەوەندیە دونیایەکان و سەرەنجڕاکێشانی خەڵکیترە بەلای زوهدەکەیدا و کۆکردنەوە و خڕکردنەوەی خەڵکی عامەیە و پەیداکردنی مورید و وابەستەکردنی خەڵکە بەتەریقەتەکەیەوە، بۆ ڕازیکردنی ئەو خەڵکە دەبێت بەرگی زوهد لەبەربکات و ڕواڵەتە دینیەکەی فریویان بدات، بۆیە عارفێکی گەورەی ئێرانی (**محەممەد** شیرین مە غریبی) بەو کەسانە دەڵێت مادام ئێوە مەرامتان مەعشوقی حەق نیە و ڕازیکردنی خەڵکە، ئیتر دەست لە مەسەلەی کوفر و ئیمان هەڵگرن و باسی مەکەن و دابەشی مەکەن بەسەر خەڵکدا.

ای کەدر قبول خاص و عامی روز و شب
کفر و ایمان رار هاکن نام این مبر

ئەی ئەو کەسە کە بەرۆژ و شەو لەهەوڵی ڕازیکردنی خەڵکی خاس و عامی واز لەباسی کوفر و ئیمان بێنەو دەستی لێ هەڵگرە و ناوی مەبە.

ئەم ڕواڵەتپەرستیە ڕەندانی ڕێگای عەشقی حەقیقەت لاناکەنەوە بەلایەوە، چونکە خاڵی بونەتەوە لەدونیاو بەناو دونیادا دەڕۆن و هیچ شتێکی دونیا کاریگەری نابێت لەسەریان و نابێتە مایەی ئامانج و هەوڵیان بۆ بەدەستهێنانی، کە حافز بە (برهنگان طریقت) ناوی دەبات بەپێچەوانەی ئەو زاهید و شێخانەی کەمەحوی بە (قوتاعی تەریقەت) ناوی دەبات و کاریان دینفرۆشیە.

بـــــرهنگان طـــریقت بەنیم جـــو نخریـــــد

قبای اگلس آن کس کە ازهنر عاری است

موجەڕەدانی تەریقەت بەنێو جۆ نایکڕن کـەوای ئـەتـڵـەس ئـەو کەسەی کەبێ هونەرو مەعریفەتە.

لەبەرئەوەی زاهید و بەناو شێخەکانی تەریقەت بەزاهیر شـێـخ و پیری تەریقەتن و لەحەقیقەتدا قوتاعی تەریقەتن و بەڕواڵەتەکەیان خـەڵـك فریو دەدەن و لەحەقیقەتیاندا ئەوانە دورن لەزوهدی عاریفانە، بۆیە حافـز واز لەزوهدی وشك و فریو دەردەهێنـێ و روودەکـاتـە خـەرابـات بـۆ بەدەستهێنانی زوهدی عاریفانە و هەرچیشی هەیە لەورێگایەدا دایـدەنـێ بەتایبەتی ئەو رەمزەیەی کە زاهیدەکان خۆیانی پێ نمایش دەکـەن، کـە خەرقە و جبەکانیانە، حافز نەك تەنها ئاوی خەرابات خرقەی زوهـدەکـەی دەبات، بەڵکو ئاگری مەیخانە عەقڵیش دەبات، چونکـە دەچـێـتـە نـاو عیشقی راستەقینە و مەست دەبێت و دەگاتە پلە بالاکانـی عـیرفـان و بەمەستبونیشی کە نوقم بوونە لەعیشقی مـەعشـوقـدا عـەقـڵـیـشـی وەزیفەکان دەوەسێ و دواتر بەئاگری عیشق دەسوتێ.

خرقە زهد مـــــرا أب خـــرابات ببرد

خانە عقل مرا آتش میخانە بسوخت

**د ح لا ١٧**

ئاوی خەرابات جبەی زوهدی برد و ئاگری مەیخانەش ماڵی عەقڵی مـنـی سوتاند.

خەرابات لەزاراوەی عیرفانیدا مەقامی تاکایەتی، واتە سالیك هەموو سیفات و کردار و خودی خۆیشی لەو مەقامەدا لەزاتی پەروەردگاردا فەنا دەبێ و هەموو کاروکردارەکان دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردگار کەیەکتاپەرستی دەگاتە لێکردنەوە و لابردنی هەموو ئەوشتانەی کەدراونەتە پاڵ خودا[18] ، کەواتە لێرەدا حافز گەیشتۆتە مەقامی بەرزی تەوحید بەوەی هەموو ئەو شتانەی کەرەمز و رواڵەتکاریە پێوەی ئاوی خەرابات بردویەتی و ئاگری نوری خواش عەقڵی لێسەندۆتەوە، کەواتە رۆشتنە ناو خەراباتەوە گەیشتنە بەیەکتا پەرستی (التوحید) بۆیە خواجە محەمەد پارسا دەفەرموێ :

هرکو بەخرابات نشد بی دینست زیرا کە خرابات اصول دینست [19]

هەریەکێ بەخەرابات نەگەیەت بێ دینە، چونکە خەرابات بنچینەی دینە

حافز پێیوایە هەتا زاهید خۆی بپێچێ بەخرقەو عەباو خۆی قەتیسکا لەچوارچێوەی رواڵەت و رەمزە زاهیریەکانی شەریعەت ناگاتە پلە بالاکانی عیشق، بۆیە زاهید دەڵێ وەرە ئاگر بەردە عەباو خەرقەی زوهد و عاشقی ئەبرۆی هیلالی ساقی بە، چونکە جوانی هیلالی میحرابی ساقی هیلالی میحرابی ئیمامی مزگەوتی تێکشکاندوە.

درخرقە زن آتش کە خم ابروی ساقی

برمی شکند گوشەی محراب امامت

**د ح لا ٨٩**

ئاگربەر بدە خەرقە چونکە هیلالی ئەبروی ساقی گۆشەی میحرابی ئیمامی شکاند.

حافز چۆن پێی وایە خەرابات مەقامی یەکتاپەرستیە و هەرکەس بگات بەو مەقامە لەهەموو سیفات و کردار و خودی خۆیشی لەناو نوری خودادا فەنادەبێ ، بەهەمان شێوە پێیوایە خەرقە مەقامی بتپەرستیە و ئەگەر دەتەوێت بگەیت بەدینی راستەقینە و مەقامی یەکتاپەرستی (التوحید) دەبێت لەناو ئەو خەرقەیە دەرچیت و روتبیتەوە لەهەموو بتپەرستیەك، چونکە بتپەرستی و هاوبەشی پەیداکردن لەژێر ئەو خەرقەدایە.

خدا از ان خرقه بیزار ست صد بار
کەصد بت باشدش در استین

خودا سەد جار لەوخەرقەیە بێزارە، کە سەد بت لەژێریدا و لەنیو قۆڵەکانیدایە.

حافز مرۆڤی خوایی بە عاشقێکی بێ باك دەبینێ و لەرواڵەتەکەیدا نایبینێ ، و لەوەدا نابینێ کە دەبێت خەڵکی باوەڕی پێیەتی بەوەی کە مرۆڤی خودایی دەبێت ڕێ و رەسمی تایبەتی هەبێت و شوێن جیاواز و جلوبەرگی جیاوازی هەبێت و ناو و نازناو کونیە لەخۆی بنێ، بۆیە حافز لەمجۆرە رواڵەتپەرستیە هەڵدێت بەرەو مەیخانەی عیشق دەڕوات وپێی وایە ئەم رۆشتنەشی بەهۆشهاتنەوەیە لەزوهدی ریاکاری کە جیهانێکی پڕ لەرواڵەتکاری فریودەرە.

ز خانقاه به میخانه میرود حافز

مگر زمست زهد ریا بهوش آمد

**د ح لا ١٧٥**

حافز لەخانەقاوە بۆ مەیخانە دەڕوات، لەبەرئەوەی لەمەستی ریای زوهد بەئاگاها تۆتەوە.

وە لەبەیتێکی تردا حافز تۆبە لەزوهدیریاکاری دەکات و دەچێتە ناو زوهدی عیرفانی و دەفەرموێ:

بشارت برکوی می فروشان

که حافز توبه از زهد ریاکرد

**د ح لا ١٣٠**

مژدە بۆ کۆڵانی مەیفرۆشان کە حافز تۆبەی لەزوهدی ریاکاری کرد.

پاشان حافز پێیوایە خانەقا شوێنی خراپکارانە و ئەوانەی لەخانەقادان خوا پەرستێکی راستەقینە نین و فریودەرن و ئەو رواڵەت و شوێن مەقامەش کەدایاناوە تەنها بۆ فریودانی خەڵکە، بۆیە خانەقا بەشوێنی روورەشەکان دادەنێ و ئەگەر دەتەوێ روو سووری لای خودا بیت دەبێت رووبکەیتە خەراپات و بە نوقم بوون لەعەشقی خودا خۆت روو سوور بکەیت.

بیا به میکده چهره أرغوانی کن

مرو به صومعه کآنجا سیاهکارانند

وەرە بۆ مەیخانە و رووت ئەرخەوانی بکە، مەڕۆ بۆ خانەقا کە شوێنی خراپەکارانە.

هەمیشە کارەکتەری زاهید کەسێکە بەرامبەرەکەی تاوانبار دەکات و تۆمەتباری دەکات بەدەرچوو لەرێبازی شەریعەت و دەرچوون لەدین، دەرچون لەدینی و رێبازی شەریعەتیش بەو پێوەر وتێگەیشتنەیە کە ئەو زاهید و شێخانە داینـاوە ، و هەر قسەو باس و تێگەیشتنێکی تر یان رەفتارێك کە نەیەتەوە لەگەڵ پێوەرەکانی ئەواندا، لای ئەوان نەهاتنەوەیە لەگەڵ پرنسیپەکانی شەریعەت و دەرچوونە لەدین، حافز پێیان دەڵێ : قسەو باسی خەڵکی بەتاوان و هەڵە لێك مەدەنەوە، گوفتاری ئەهلی دڵ جیاوازە لەگوفتار و پێوەرەکانی ئێوە، کە ئێوە تێناگەن و زاهیر بینن و ئاگاتان لەنهێنیەکانی دڵ نیە و قسەناس نین، ئیتر تۆمەت بەسەر خەڵکدا دابەش مەکەن و خەلەلەکە لە قسەی ئەهلی دڵدا نیە، خەلەلەکە لەوەدایە کە ئێوە تێناگەن:

چو بشنوی سخن اهل دل مگوکه خطاست

سخن شناس نەای جان من خطا اینجاست

**د ح لا ٢٢**

کاتێ گوێت لەقسەی ئەهلی دڵ دەبێت مەڵێ هەڵەیە، هەڵە لەوەدایە تۆ قسەناس نیت.

لەبەرئەوەی زاهید لەقسەی رەندێکی وەك حافز تێناگات ئەوا وەك دێو وایە کەلەکاتی خوێندنی قورئاندا هەڵدێت، دیارە (دێو) تاقمە خراپەکەی جنۆکەیە، حافزیش بەچواردە خوێندنەوە (قراْات) قورئانی لەبەربوو، هەروەك چۆن جنۆکە خراپەکان لەکاتی خوێندنی قورئاندا بێزار

و قەڵسن هەروەك مەحوی وتی زاهید بەباسی عیشق دەکەوێتە جولەجـوڵ بۆ هەڵهاتن، بەهەمانشێوە حافزیش دەڵێ : زاهید لەباسـی عـیـشـق و ڕەندی هەڵدێت هەروەك چۆن دێو لەخوێندنی قورئاندا هەڵدێت.

زاهد ار رندی خافز نکند فهم چـهشد
دیو بگریزد از آن قوم که قرآن خوانند

**د ح لا ١٩٣**

کەزاهید لە ڕەندی حافز تێناگات چ باك، دێو لەو کۆمەڵە هەڵدێت کە قورئان دەخوێنن.

لەزۆر جێگادا حافز لەشێوەی توانجدا بەزاهید دەڵێ : تۆبڕۆ بەدوای کاری خۆتدا ئەگەر دڵسۆزیت دەنوێنێ بزانە هەرکەسەو گـونـاهـی خـۆی بەکۆڵی خۆیەوەیە و کەس گوناهی کەسێکی تری بۆ نانوسرێت.

عیب رندان مکن ای زاهد پاکیزه سرشت
کـــه گناه دگـرانی بـرتو نخواهند بنوشت

**د ح لا ٨٠**

عەیبی ڕەندان مەکە ئەی زاهید پاك سروشت، چونکە گـونـاهـی خەڵکانی دیکە بۆتۆ نانوسرێت.

لێرە تانە لەزاهید دەدات بەوەی خۆی بەکەسێکی پاك سروشت دەزانێ و پاك بوەتەوە لەهەموو خراپەیەك، حافزیش هەر بەزمانی دەستەواژەکەی خۆی پێی دەڵێ : برۆ بەدوای کاری خۆتەوە ئەی پیری پاك سروشت، لەبەیتێکی تردا بەزاهیدەکان دەڵێ : هەموو کەسێك دورێنەی رەنجی خۆی دەکات، چی بچێنێ ئەوە دەدورێتەوە و هەرکەس خراپەو چاکەی خۆی بۆ دەنوسرێت ئەمەش ئاماژەیە بەئایەتی (ولا تزرو زرارة وزر اخری).

من اگر نیکم و گر بد تو برو خود را کوش

هر کسی آن درود عاقبت کار که کیشت

**د ح لا٨٠**

من ئەگەر چاکم و ئەگەر خراپ تۆ برۆ و هەوڵ بۆ خۆت بدە، لەکۆتاییدا هەرکەسێ ئەوە دورێنە دەکات کە چاندویەتی.

مادام زاهید ئەوەندە رەند و یارانی خەرابات بەخراپ دەزانێ حافز پێی دەڵێ : تۆ لەکوچەو کۆڵانی ئێمە بەسەلامەتی تێپەڕە با نەڵێن هاورێ ئەوانە و ناوت بەخراپی وەك ئێمە بڕوات و بێ سەروسەرمایە بمێنیتەوە.

زاهد از کوچەرندان بەسلامت بگذر

تاخراب نکند صحبت بدنامی چند

**د ح لا ١٨٢**

زاهید لەکۆڵانی رەندانەوە بەسەلامەتی تێپەڕە، تا هاودەمی چەند بەدناوێك خراپت نەکات.

دیارە رەندەکان مەلامەتین کە رەفتار و کردارە خراپەکانیان نەدەشاردەوەو هەندێ کرداری خراپەشیان دەکرد و کردارە چاکەکانیانیش دەشاردەوە، بۆ ئەوەی توشی عوجب وریا نەبن، حافزیش دەڵێ زاهید هاوڕیی ئەمانە بەد ناوت دەکات خۆت لێیان دوور بگرە ، چونکە تۆ مەبەستت ناوو ناوبانگە ومەبە ستی دیاری حەقیقەتت نییە.

بەڵام زاهید لە خراپ باسکردن و لۆمەکردن کۆڵ نادات و کێشەکەیشی لەوەدایە بەهەڵە حاڵی بوە لەرێگای عیشقی حەقیقەت و ئاوێنەی ئیدراکی دوکەڵاویە و ناتوانێت هەموو شتەکان بەتەواوی ببینێ و بەلێڵی وتاریکی شتەکان دەبینێ و بەڵێڵی و تاریکی شتەکان دەبینێ، بۆیە لێکدانەوەکەیشی لێڵ وتاریکە، و دواتر ئەنجامگیریەکی هەڵەی بۆ دەردەچێت دەربارەی ئەهلی دڵ، حافزیش زۆر داوایان لێدەکات کە ئەوان دەم لەشتێك مەدەن کەلێی تێناگەن و زاهیریانە لێکیمەدەنەوە، چونکە جیهانی عیشق و عیرفان جیهانێکی ترەو جیاوازە لەجیهانی شەریعەت و زاهیری دەقەکان، بەڵام ئەوان هەرسورن لەسەر ئەو تۆمەتانە و بەپێوەرکانی خۆیان دەیپێون، بۆیە حافزیش وەك ئەهلی دڵانی تر بێتاقەت دەبێت و ئاه هەڵدەکێشن و دوعا لەزاهید دەکات کە پەروەردگار بەتەواوی دوکەڵی ئاهێك بخاتە ئیدراکیانەوە بۆ ئەوەی بەتەواوی کوێر بن و روناهی تیادانەمێنێ وبیکاتە تاریکستان.

یارب آن زاهد خودبین که بجز عیب ندید

دود آهیش در آیئنه ادراك انـــــداز

**د ح لا ٢٦٤**

خوایە ئەو زاهیدە خۆپەسە ندە، کە جگە عەیب هیچی تر نابینێ دوکەڵی ئاهێك بخە ئاوێنەی ئیدراکیەوە.

لەکۆتاییدا حافز روو دەکاتە رەندەکان کە نهێنیەکانی عیشق لای زاهیدە نامحرەمەکان باس مەکەن، چونکە ئەم رازانە بەئەوان نامۆیە و ئەو جیلوەی نوری خودا کە ئێوە لەخەراباتدا دەیبینن ئەوان نایبینن و نابێت باسی بکەن، چونکە دەبێتە مایەی فیتنە هەروەك چۆن مەنسوری حەلاج باسی کرد و بووە مایەی فیتنەیەکی گەورە و سەری خۆشی لەرێدا دانا.

پیش زاهد از رندی دم مزن کە نتوان گفت
باطبیب نامحرم حال درنهانی

لەبەردەم زاهد دا باس رەندی مەکە، تۆ ناتوانیت حاڵی دەردی رازی خۆت بخەیتە بەردەم پزیشکی نامحرەم.

❊❊

## وێنەی پۆزەتیڤی زاهید

لەچەند بەیتێکی کەمدا حافز ناوی زاهید و سۆفی بەباشی هێناوە، ئەڵبەتە مەبەستی ئەو زاهیدانەیە کە ڕێگای ڕاستی خواپەرستیان گرتۆتەبەر بە مەبەستی گەیشتن بە پلە باڵاکانی عیشق، واتە مەبەستی ئەو زاهید و سۆفیە ڕاستەقینانەن نەك ڕواڵەتی و فریودەرەکان و خۆپەرستەکان کە ڕێگای سلوکیان گرتۆتەبەر بۆ گەیشتن بەلابردنی خودی خۆیان لەنێوان ئەوان و حەقیقەتدا، ئەو ڕێگایەش ئەوان لەسلوك و مانەوە لەخانەقا و خەڵوەت بۆ بەخۆدا چونەوەیە پاککردنەوەی نەفسە لەو خڵتە و خەوشانەی کەبەرۆحی پاك مرۆڤانەیاندا نوساوە و گەیاندویەتی بەپلەی بەرزی دڵنیایی.

در صومعه زاهید و در خلوت صوفی

جر گوشه ابروی تو محـراب دعا نیست

**د ح لا ٦٩**

لەخانەقای زاهید و لەخەڵوەتی سۆفیدا، جگەلەگۆشەی برۆی تۆ میحرابی دوعا نییە.

لەبەیتێکی تردا حافز باس لەجورئەتی زاهیدا دەکات کاتێك پەیمانی خەڵوەتنشینی خۆی لە خانەقاو چلەکێشانی دەشکێن و ڕوو دەکاتە مەیخانەی عیشق و ڕێگای عیرفان دەگرێتەبەر، ئەڵبەتە خەڵوەتنشینی لەزۆر شوێندا حافز بەخراپی باسی دەکات کە لەگەڵ

عیشقدا ناگونجێ و ئەگەر دەتەوێ بگەیت بەحەقیقەت دەبێت لەچوار دیواری خانەقا و خرقەی زوهد بێیتەدەر و رووبکەیتە فەزای پاك و فراوانی عیشق و تەجلی نوری خودا ببینی لەبوندا، بۆیە حافز لەزۆر شوێندا بەزاهید دەڵێ پێیەك هەڵگرە و لەخانەقا و خیرقەت وەرە دەرەوە بەرەو عیشق برۆو و سەفەر بەرەو ئەو ئاستانەی بەرزی عیشق بکە و خۆت قەتیس مەکە لەنیوخانەقا و خرقەدا.

بەعزم مــرحله عشق پیش نه قدمی

کەسودها کنی ار این سفر توانی کرد

**د ح لا ١٤٣**

بەنیازی گەیشتن بەقۆناغی پێشکەوتووی عەشقەوە هەنگاوێ هەڵگرە، گەربتوانیێ ئەم سەفەرە بکەی قازانجی زۆر دەکەیت.

حافز پێیوایە لەخانەقادا جێگای عیشق نابێتەوە، چونکە لەتێڕوانینی عیرفانیدا ئەوە عیشق بوو کە ئاسمان و کێوو وشاخەکان نەیانتوانی هەڵیبگرن و مرۆڤە عاشقەکان هەڵیانگرت و عیشقیش دەبێت مەحرەمانە بێت، چونکە عیشقبازی رازێکی تایبەتی نێوان عاشق و مەعشوقە و ناکرێت لەگەڵ زاهید و سۆفیەکانی نێو خانەقادا تێکەڵ بکرێت، چونکە ئەگەر رازی عیشق ئاشکرا ببێت، نیشتەگاکانی خانەقا سەری لێدەرناکەن و دەبێتە مایەی زۆر کێشە و فیتنەی گەورە.

در خانقه نگنجد اسرار عشق بازی

جام می مغانه هم بامغان توان زد

**د ح لا ١٥٤**

نهێنیەکانی عیشقبازی لەخانەقادا جێگای نابێتەوە، پێکی مەی موغانە دەبێ ت لەگەڵ موغاندا هەڵدرێت.

لەبەرئەوە حافز لەو بەیتەی لەسەرەتاوە هێنامان باسی زاهید بەپۆزەتیڤ دەکات، چونکە مەبەستی رێگای عیشق بوو ئامانجی فرۆفێڵ و دینبازی و زوهد فرۆشی نەبووە، بۆیە لەخانەقاوە دەرچوو رێگای عیشقی گرتەبەر، عارفێکی ئێرانی دەفەرموێ:

باعاشقان نشین و همەی عاشقی گزین

باهر کە نیست عاشق هرگز مشو قرین

لەگەڵ عاشقاندا دانیشە و هەموو عاشقان هەڵبژێرە و مەبە بەهاورێی ئەوانەی عاشق نین.



#) واتل علیهم نباءالذی اتیناة ایاتنا فانسلخ منها فاتبعة الشیطان فاصبح من الغاوین.ولوشئنا لرفعناة بها ولکنة اخلد الی الارض واتبع هواة فمثلة کمثل الکلب ان تحمل علیة یلهث اوتترکة یلهث ذلك مثل القومالذي کذبو بایاتنا فاقصص القصص لعلهم یتفکرون.

*) ئه م به یته لەو دیوانەدا نەبوو کە بە نوسخەی( قاسم غنی و محمدقزوینی )دەناسرێت وئێمه پشتما ن پێبەستبوو بەلاّم لە (شرح عرفانی غزلهای حافظ)دا هاتووەو غەزەلەکە بەم سە رەتایە دەستپێدەکات :

بەجان یار قدیم به حق عهد درست
که مونس دم صبحم دعای دولت توست
**

**پەراوێزەکان**

١. لە مێژووی فیرقە ئیسلامییەکاندا دوو فیرقە دروستبوون بەناوی (قەدەرییە و جەبرییە)، قەدەرییە، کۆمەڵی (جەعدی کوڕی دەرهەمی سەفوانی راسیبی) بوو،. ئەمانە نەفی هەمووتواناییەکی مرۆڤیان دەکرد و پێیانوابوو مرۆڤ هیچ ئیرادە و توانایەکی نییە لە کردار و رەفتاری خۆیدا و ئاستی ئیرادە و هەڵبژاردنی مرۆڤیان دەگەیاندە ئاستی ئاژەڵ و بێگیانەکان.

کۆمەڵی دووەمیشیان (جەبرییەکان) کۆمەڵی (مەعبەدی کوڕی غیلانی دیمەشقی) بوون، پێیانوابوو هەمووکردار و رەفتارێکی مرۆڤ قەدەری خوایە و تەنها بەپێی قەدەری خوا دەکرێت و هیچ دەسەڵاتێکی مرۆڤی تێدا

نییە و ئەم بۆچوونانە لە نێو زانا ئیسلامییەکاندا بوو بەهۆی دروستبوونی جەدەلێکی زۆر و لە لایەن بەشێکی زۆریانەوە رەد درایەوە و چەندەها بەڵگەیان لە قورئان و سووننەت و بەڵگەی عەقڵییان دەهێنایەوە لەسەر بەتاڵیی ئەم بیروباوەڕە.

٢. ئەم بەیتە لەو دیوانەدا نەبوو کە بە نووسخەی (قاسم غەنی و محەممەد قەزوینی) دەناسرێت و ئێمە پشتمان پێبەستبوو، بەڵام لە کتێبی (شرح عرفانی غزالهای حافظ)دا هاتووە و غەزەلەکە بەم سەرەتایە دەستپێدەکات:

به جان یار قدیم به حق عهد درست

که مونس دم صبحم دعای دولت توست

٣. بە قەناعەتی من ئەو کەسەی کە مەحوی دەربارەی دەڵێ: (خۆیشم نەگەیە ئەو کەسە بکا بە کەس) مەبەستی مەولانا خالیدە کە مەحوی نەکەوتە سەردەمەکەی و ببێت بە موریدی، بە تایبەتی ئێمە دەزانین کە مەحوی دوای ئەو قەسیدەیەی لە ستایشی خوا و پێغەمبەر (د. خ) وتوویەتی، تەنها مەولانا خالیدە، کە مەحوی لە قەسیدەیەکی سەربەخۆدا ستایشیدەکات.

٤. احیاءعلوم الدین، ابی حامد الغزالی، ج ٤ ، دار صادر بیروت، ط ٢، ٢٠٠٤، لا ٢٧٢

٥. هەمان سەرچاوە، لا ٢٩٩

٦. حدیث صحیح متفق علیه

٧. حدیث صحیح رواه بخاري في صحیحع

٨. جاران شەراب و مەی میسکیان تێکەڵدەکرد بۆ ئەوەی بۆن و تامی خۆشبێت و زاراوەی مەی میسکبار لە شیعری حافزدا زۆر هاتووە.

٩. سورەتی (الاحزاب) ئایەتی (٧٢)

١٠. سورەتی (النجم) ئایەتی (٣٢)

١١. رواه البزاز ز طبراني والبيهقي في (الشعب)

١٢. وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ / الاعراف ١٧٥

١٣. کارەکتەری دەروێش لە شیعری زۆربەی شاعیرەکاندا چ فارس زمانەکان یان شاعیرە کوردەکاندا بە پۆزەتیڤ باسکراوە کە لە باسێکی تر دێینە سەری.

١٤. سەبوور عەبدولکەریم، رەنگدانەوەی کەسێتی و دنیابینی حەللاج، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، لا: ٦٢

١٥. سورەتی (الاعراف) ئایەتی (١٠٧)

١٦. م. عەبدوڵڵا قەرەداغی، دەیری عەشق، دەستنووسی چاپ نەکراو.

١٧. ئەکرم عەنەبی، مەحرەمی راز، شەرحی غەزلیاتی حافز، بەرگی یەکەم، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٨.

١٨. ابو الحسن عبدالرحمن ختمي لاهوري، شرح عرفاني غزلهاي حافظ، مجلد دوم، چاپ ششم، ١٣٨٧، نشره قطرة، لا ١٥١٥.

١٩. سورەتی (الطارق) ئایەتی (٩)

٢٠. لاهوري، شرح عرفاني غزلهاي حافظ، سەرچاوەی پێشوو، مجلد ٣، لا ١٧٠٣ - ١٧٠٤

٢١. لاهوري، شرح عرفاني غزلهاي حافظ، سەرچاوەی پێشوو، مجلد ٣، لا ٢٣٠٢

٢٢. لاهوري، شرح عرفاني غزلهاي حافظ، سەرچاوەی پێشوو، مجلد ١، لا ٥٣

٢٣. سورەتی (الانعام) ئایەتی (١٦٤)

**سەرچاوەکان:**

١. قورئانی پیرۆز
٢. دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەممەدی مەلا کریم، چاپی دووەم، چاپخانەی (دار آفاق عربية) بەغد، ١٩٨٤.
٣. عەبدوڵڵا قەرەداغی، دەیری عەشق، چاپنەکراو.
٤. ئەحمەدی مەلا، مەحوی لە نێوان زاهیرەیەت و باتنییەتدا و سەرچاوەکانی عیشق و وێنەی مەعشوقدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزراەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٩
٥. سەبور عەبدولکەریم (شکار)، ڕەنگدانەوەی کەسیەتی و دنیابینی حەلاج لە شیعری کلاسیکی کوردی و فارسیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠٠٩
٦. دیوانی حافظ، نسخه قاسم غنی و محمد قزوینی، چاپی اول، چاپخانەی ناسر، ناشر فراگفت، رقم ١٣٨٨
٧. ابو الحسن عبدالرحمن ختمی لاهوری و تصحیح و تعلیقات بهاالدین خرمشاهی، کورش منصوری، حسین مطیعي امینی، شرح عرفانی غزلهای حافظ، چاپی ششم، نشر قطرة، چاپ سارنگ، تهران ١٣٧٨
٨. عبدالله ابهری، دیوان حافظ باشرح کامل، منزل به منزل باحافظ، چاپ دوم، انتشارات طلایه، تهران ١٣٨٣
٩. ابي حامد محمد بن الغزالي، احیاء علوم الدین، الطبعة الثانیة، دار صادر، بیروت، ٢٠٠٤
١٠. ئەکرەم عەنەبی، مەحرەمی راز، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، دهۆك، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨

## وێناکردن و، وێنا لای "مەحوی" ی شاعیر
## زوبێر علی عارف

قسەکردن و نوسین لەسەر هەر شتێك پێویستی بە دیاریی و ڕوونی مەبەست هەیە و، شێوازی درکاندن و خستنەڕوو و باسکردنی بابەتەکەش ئاتاجی ئەوەیە کە بەجۆرێك لە جۆرەکان ناڕوونی و شاردنەوەو تێکەڵکردنی تێدا نەبێت. ئەوەی من لێرەدا دەمەوێ بیخەمەڕوو شیکردنەوە و تەنها نمونە هێنانەوەی شیعری مەحوی نییە، بەڵکو دەمەوێ هەم بە خودی شیعرەکانی خۆی ئیتر ئەوانەی کە لە بابەتەکەدا هاتوون یا خود نەهاتوون، ئەوە بخەمە ڕوو ئایا وێناکردن لای مەحوی چۆن بووە؟ ئایا پەی بە شتێك بردووە کە کەسی پێش خۆی پەی پێ نەبردبێت؟ ئەو چۆن لە ژیان و مانای ژیانی ڕوانیوە؟ وێنای بۆ مەحبوبی خۆی چۆن بووە؟ بەچی و چۆن لە دەورووبەری ڕوانیوە؟

ڕەنگە هەر لەسەرەتاوە باشتر وابێت ئەوە بڵێین کە مەحوی هەم زۆری لەسەر نوسراوە و هەم لایەنی زۆری ژیان و بەرهەم و بیری خراوەتە ڕوو، ئیتر ئایا بەرزی و بڵندی و حەق پێدانی چۆن بووە ئەوە شتێکی ترە. بەڵام بەبڕوای من لەمە بەدوا بۆ ئەم شاعیرە بێت یان شاعیرانی ترمان پێویستمان بە جۆرێکی تر و بەجیا لێکۆڵینەوە کردنە لەسەر لایەنەکانی مەحوی بەدەر لە تەسەوف و بوون و ، بەڵکۆ بێین مامەڵەیەکی ورد لەگەڵ چەمکەکان بکەین و ئەوە بخەینەڕوو کە مانای چییە و پەیام و مەبەستی چییەو چۆن بیگوازینەوە بۆ ناو ناخ و ژیانمان و کاری پێ بکەین و،

ژیانێکی راستەقینەی مەعنەوییانەی پێ بخولقێنین. واتە دەبێ ئێمە هەوڵی زیاترمان بۆ گواستنەوەی زانیاری و پەیام و مەبەست بێت بۆ خۆمان و بە دەورووبەرمان، ئەمەش دەکەوێتە سەر ئەوەی کە چۆن وێنای خۆمان و زانست و مەعریفە و بەرامبەرمان دەکەین و، چۆن وێنامان پڕدەکەین لە بەهای ژینداری و مەعریفەی دروست ژیان و، دروست خوێندنەوە. وێناکردن پێویستی و ئاتاجی ژیانە و هەرکەس لێیەوە زۆر نزیك بێت پێویست دەکات لە بەشێکی زۆری خۆی پێ بەهرەمەند بکات و بە وێناکردنی وێنای وێنا بکات و لە ناخ و دڵ و دەرك و چاویدا بیکاتە چاوی دڵ و چاوی بینین و چاوی پاك ژیان و پاك بینین.




ئەوەی گرنگە و سەرەتا و پێش چوونە ناو وێناکردن لای مەحوی پێویستە باسی بکەین، بریتییە لە خودی وێناکردن و خستنەڕووی خۆی و دەرك پێکردنی و، بوون بەشێك - بەڵکو تەواوی- لەناو گیان و دڵ و چاودا. وێناکردن بریتییە لە خوێندنەوەی گەوهەر و ماهییەتی ئەو شتە یا خود لایەنێکی زۆری سەنگینی و گرنگی ئەو شتەی کە کەوتووەتە بەرهەستمان، ئیتر ئایا بیرکردنەوە بێت یاخود بینین.

واتە وێناكردن بریتییە لە دەرككردن بە لایەنە نادیار و شاراوەكانی ئەوەی كە دەمانەوێ ببیبنین یاخود هەستی پێ بكەین یان مامەڵەی لەگەڵ بكەین یان لە ژیاندا بیخوێنینەوە، كە ئەمەش بێگومان هەر وا بە سادەیی و سانایی ناكرێت و، پێویستی بە خۆراكێكی ڕۆحی باش هەیە كە پەی بە بینایی چاوی دڵ ببات و بیكاتە چاوێك بۆ ئاراستەكردنی چاوی سەر، ئەمە جگەلەوەی كە شانبەشانی دۆزینەوەی خۆراكی ڕۆحی و مەعنەوی بۆی دیسانەوە پێویستی بە پەروەردەكردنێكی هاوئاراستەیی هەیە لەگەڵ توانا و كاریگەری ئەو خۆراكە مەعنەوییە، ئەمەش بۆ ئەوەیە پەروەردەكردنی ئەو گیانە و بوون بە خاوەنی چاوی دڵ و وێناكردن، حەقیقەتی خۆی وەربگرێت و ئەوە ببەخشێت بە كەسەكە ئیتر بە تیڕوانین و نیگایەكی ترەوە لە شتەكان بڕوانێت و، تاڕادەیەك پەی بە لایەنی شاراوەی شتەكان ببات و دەركیان بكات و ئەو ڕۆح و قورسایی و گیانەی كە هەیانە ئەم بە شێوەیەكی ڕێژەیی لێی نزیك ببێتەوە و بتوانێت خوێندنەوەیەكی نزیك لە خۆیانی بۆ بكات و بیانناسێت و بیانناسێنێت. بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی مەبەستەكەمان ئەو هێڵكارییەی سەرەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەكاتەوە كە چۆن كەسی خاوەنی وێنا لە شتەكان دەڕوانێت و وێنایان دەكات و كام وێنەیەی ئەو شتە یاخود كام بینینە كە وێنا دروست دەكات. ئەگەر سەرنج بدەین هێڵكارییەكە لە خاڵی (١) دەست پێدەكات و ئەو كەسەی كە وێنا دەكاتە باكگراوندەكەی كاریگەری لەسەری هەیە و هێڵەكە لە پشتەوە دەست بە ڕۆشتن دەكات و، ئەوەشی كە وێنای دەكات واتە خاڵی (٢) دیسانەوە هێڵەكە دەكەوێتە پشتەوەی كە ئەمەش مەبەست لێی لایەنی شاراوە و نادیاری شتەكەیە، واتە شتێك

هەیە کە وا لە کەسەکە دەکات بەوجۆرە ببینێت و دیوە شاراوەکانی شتەکەی مەبەست بێت هەربۆیە دەبینین هێڵکارییەکە بۆ پشتەوەی شتەکە ڕۆشتەوە، لە خاڵی (٣) ئیتر ئەوەی دەستی کەوتووە دیسانەوە دەیگوێزێتەوە بۆ خاڵی (٤) واتە مێشك و بیری کەسەکە، لێرەوە ئیتر ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەوەی کە لای کەسەکە دروست دەبێت هێنانی ماناو ماهییەتەی شت یان بابەتەکەیە - بەگوێرەی توانای دەرکی و ناسین - کە خودی ئەو ماناو وێنە لە خاڵی (٣) دەهێنیتەوە بۆ (٤) دەتوانین بڵێین ئیتر ئەوەی لە مێشکی ئەمدا دروست بووە و سەری هەڵداوە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە تا چەندە توانیویەتی بینین و مانا لە شتەکەوە بهێنێتەوە، کە ئەمەش هەروا شتێکی هەرەمەکی و لەخۆوە نییە، بەڵکو دەکەوێتە سەر مەعریفەی کەسەکە و پەروەردەکردنی چاوی دڵ و ناخ و، بە جوان ڕوانین لە ماهییەتی بابەت و شتەکان.

کەواتە وێناکردن بریتییە لە خوێندنەوەی ماهییەتی شتەکان و زیاترین لایەنی شاراوەی شتەکان بە چاوی دڵ هەستی پێ بکرێت و هەردەم ئەو دیوی شتەکان و لایەنە شاراوەکانی شتەکانمان لەیاد و لەبەرچاو بێت تا خوێندنەوەکانمان پێش ناسینی خودی بابەت و شتەکە بەسەر مێشك و بیرماندا زال نەبن، بەڵکو لە ناسینی ڕاستەقینەی بابەت و شتەکانەوە بیرو وێنا لە ناو دڵ و دەروون و مێشکماندا سەرهەڵبدات و پەییان پێ ببەین و دەرکیان بکەین و بیانناسین و بیانناسێنین. وێناکردنیش چاوی مەعنەوی و دڵی زیندووی پەروەردەکراو و، ڕامان و لێوردبوونەوەی زۆری دەوێ تا بتوانین تاڕادەیەك لەناو وجود و دڵ و دەرووندا دروستی بکەین و بیکەینە چاوی بینین و بیری خوێندنەوەی شتەکان.

بۆئەوەی زیاتر لە گرنگی و بایەخ و چۆنیەتی وێناکردن بڕوانین، بە پێویستی دەزانم چەند نمونەیەکی شیعری بخەمە ڕوو، کە تێیدا ئاماژەدانە بە لایەنی شاراوەی مرۆڤ و چۆنیەتی پەیبردن بە بایەخ و ماهییەتی شتەکان و بەجوانی وێناکردنیان، بۆ نمونە "مولانای ڕۆمی" دەڵێت:

جان شو و از راه جان جان را شناس

یار بینش شو نه فرزند قیاس

لەم بەیتەی سەرەوەدا لە کتێبی (باپیر بلخ، محمد جعفر مصفا) لە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەیدا دەڵێت: (یار بینش) یانی " لەگەڵ ڕوانین و نیگادا بوون بەیەك و هاوتابوون" و ئەوەش دەخاتە ڕوو کە (بینش) بریتی نییە لە (اندیشە) و مەولانا لەم بەیتەدا دەڵێت سەیری خۆت و ژیانت بکە و ڕابمێنە.

تەواوی هەوڵ و کۆششی مەولانا ئەوەیە کە ئێمە لەم دونیا وشك و کۆنە و مەجازی و بێ ڕۆحە کە لەو گوزارشتە وێنەییانەی کە بۆ خۆمانمان دروست کردووە بەرەو دونیایەکی ترمان ببات و بمانخاتە ناوییەوە، دونیایەکی تر کە گیان و فیترەتی ئێمەیەو ، دونیایەکە زیندوو و پڕە لە جوانی و ناسکی. لەم دونیا نوییەدا هیچ شتێك ناسراو و دیاریکراو نییە. چونکە دیاریکراو"تعیین" و ناسین و ئاشنایی "شناختگی" هەر دەبنە سیفەتی کۆنەیی و کۆنەبوون. ئەو چەندان جار جەخت دەکاتەوە کە دەست لەم بوونە "دونیا" کۆنە هەڵگەرین[1]، بۆ ئەوەی بتوانین پەی بە عالەمێکی نوێی ببەین، کە عالەمێکی پڕ لە ئاشکرا و نهێنییە، وەك دەڵێت:[2]

تا ببینی عالم جان جدید
عالمی بس آشکار و ناپدید




کەواتە هەبوونی چاو و دڵێکی خاوەن وێنا سەرەتا و پێویستییەکی زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بتوانین بەو عالەمە بگەین کە مەولانا باسی دەکات، کە سەرەتا پێویستی بە داواکردن و خواستنی چاوی خاوەن بینابیە، چاوێك وێنا نادیارەکان ببینێت، چاوێك وێنا دروست بکات و وێنا لای کەسەکە بەدی بهێنێ، چاوێك کە هەم خۆی پڕبێت لە قوڵی و ڕاز و گەورەیی هەم بتوانێت ڕاز و گەورەیی و گەوهەریی شتەکانیش پەی پێببات، چاوێك ژیان و دونیا بەجوانی ببینێت، چاوێك بێت جوان ببینێت نەك ئەوەی خۆی جوان بێت، وەك ئەم دو بەیتە کە داومان لێدەکات چاوی

خاوەن وێنا و جوانی داوا بکەین تا بتوانین ڕازی جوانی تێدا ببینین و دونیای پێ بە جوانی ببینین، چونکە چاوی جوان بە هەموو کەس یان بە زۆربەی مرۆڤەکان دراوە، بەڵام ئەوەی لەسەر تۆیە ئەوەیە کە بەدوای چاوی جوانبینییەوە بیت و داوای چاوی دڵ و وێنا کردن بکەیت، تا بتوانیت لە ڕاز و نهێنی جوانیی بگەیت:(٣)

از خدایت دیده بینا بخواه
راز زیبایی در آن پیدا بخواه
دیده زیبا بهر کس داده‌اند
دید زیبا دیدن دنیا بخواه

چونکە بۆ ئەوەی بتوانین خاوەنی ئەو چاوە بین و وێنای ژیان و هەستی و دەوروبەرمان بکەین ئەوا تەنیا کردنەوەی چاوی سەر و زۆر وردبوونەوە و ڕامان لە شتەکان بەس نییە، بەڵکو پێویستە ئەوەش بە زیندووی و پاك و بێگەردی ڕاگرین کە پەیوەستە بە چاوەوە، کە ئەویش دڵە و ڕۆحە، کە بێگومان مەبەست لە دڵ ئەو دڵە نییە کە بەشێك و ئەندامێکی لەشە بەڵکو گیان و ڕۆح دەگرێتەوە، چونکە ئەگەر هات و دڵ لەبیر بکەین و هەست بە ماهییەت و گرنگیی نەکەین ئەوا ناتوانین ئەو وێنایەمان دەستکەوێت کە پێویست و ڕاستەقینە، چونکە چاو بە تەنیا خۆی توانای ئەوەی نییە و ناتوانێت وێنەیەکی ڕاستەقینەی شتەکانی دەسکەوێت و مانای ڕاستەقینەیان لێوەربگرێت، وەك لەم بەیتەدا (د.خسروانی) دەڵێت:(٤)

با چشم های باز و دلی بسته کی شود
دریافت راز اینهمه الطاف کردگار

دیسانەوە هەر بۆ خستنەڕووی گرنگی چاوی دڵ و چاوی وێناکردن و حەقیقەت بینین و، و بینینی لایەنە نادیارەکانی جیهان و ژیان گەورە شاعیری ئێران "حافظ"ی شیرازی باس لە کردنەوەی چاوی دڵ دەکات بۆ بینینی جیهانی نەبینراو و نادیار دەڵێت:

چشم دل باز کن که جان بینی
آنچه نادینی است آن بینی

لێرەدا شاعیر ئەو گرنگییەی خستووەتە ڕوو کە ئەوەی بە چاوی دڵ دەکرێت بە شتەکانی تر ناکرێت، ئێمەش بۆ ئەوەی بتوانین لایەنە نادیار و شاراوەکانی جیهان و ژیان ببینین پێویستە چاوی دڵمان کراوە بێت و بە کراوەیی بیهێڵینەوە تا بتوانین خاوەن ڕوانینی قوڵ و ڕاستەقینەی پەیبردن بە گەوهەرەکانی ناو ژیان بین، بینینێك پڕ بێت لە وێنا، وێنایەك پڕ لە خوێندنەوەی لایەنە شاراو و نادیارەکان (بێگومان لایەنە نادیارو شاراوەکان هەمیشە فراوانتر و زۆرترن لە لایەنە دیار و ئاشکراکان، واتە ئەوەی ئێمە بەچاوی سەر دەیبینین زۆر کەمترە لەوەی کە چاوی دڵ دەتوانێت بیبینێت.)[٥] چونکە جیهان و عالەمێکی گەورە لەناو ناخ و بوونی مندا هەیە کە بە بینینە ڕووکەشەکان ناکرێت پەی پێببرێت بەڵکو پێویستی بە بینینێکە قوڵ بێت وەك دڵ، هەر بۆیە چاوی دڵ دەتوانێت پەی ببات، و جیهانی بۆ نەمایان بکات و بیخاتە پێش چاو، وەك پێشتر

ئاماژەمان پێکرد ئەوە دلە ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ نییە، بەڵکو دڵ و ڕۆح و گیانە و هەستی مرۆڤە، وەك لە نیشاندانی ئەو نهێنییانەدا و خستنەڕووی گەورەیی ئەو دڵە بۆ وێنا کردن و نیشاندانی جیهان (خسروانی) دەڵێت: (٦)

یك جهان گشته نهان در جان من
دل نمایاند به من جانان من

یان دیسانەوە لە بەیتێکی تردا دەڵێت: (٧)

دانی که چرا چشم شود پیر به ایام
زیرا که نباید پس از آن خویش ببیند

ئەم بەیتە ئاماژە بۆ بوونە پیر و خاوەن ئەزموون و "عارف"ی چاو دەکات، واتە مامەڵەی دەبێتە پیرێك کە هەردەم دەیەوێت یارمەتی خەڵك بدات و خەڵك ببێنێت و، واتە وێنای چاوی ئەو بریتییە لە بینینی بەرامبەر و چاو خستنەسەر حەقیقەت، ئەوەی گرنگە ئەوەیە لێرەدا خستنە ڕووی لایەنێکی چاوە و دانەپاڵی سیفەتی پیر و پێگەشتووە بۆی، چونکە چاو ئەرکی تەنیا بریتی نییە لە بینینێکی ڕووکەش بەڵکو خۆ ئامادەکردنە بۆ نوێنەرایەتی کردنی پەیامێك بۆ وێناکردن و بیرێکی قوڵ، ئەمە جگە لەوەی دەرککردن و خوێندنەوەی بەرامبەر و ناسینی بەرامبەرە، کە چاوی دڵیش سیفەتێکی ئەوەیە بەرامبەر بەجوانی دەخوێنێتەوە و ماناو وێنەی ڕاستەقینەی لێوەردەگرێت.

گرنگی چاو و وێناکردن دەتوانین بڵێین لەم دوو بەیتەی خوارەوەدا بەتەواوی دەردەکەوێت، بەوەی کە مولانای ڕۆمی ئەوەمان بۆ دەخاتەڕوو، کە مرۆڤ بریتییە وێناکردن و، ئیتر ئەوەی جگە لە وێناکردنی دەمێنێتەوە بریتییە لە پێست، کە لێرەدا مەبەست لە پێست جەستەی مرۆڤە کە لایەنە ماددییەکەی دەگرێتەوە، واتە لێرەدا وێناکردن و بینینی راستەقینەی هێندە گەورە نیشان داوە کە هەموو وجودی ئێمە دەتوانێت لە ڕوانگەیەوە ماهییەت و بەهای راستەقینە بۆ خۆی و بۆ شتەکان دەرك پێ بکات و بزانێت کە دەبێ چی ببینێت و چۆن ببینێت و لەبەرچی ببینێت؟ کە ئەمەش دەکەوێتەسەر ئەوەی کە تا چەندە بتوانین وێنای ئەو چاوە حەقیقییە بکەین و پەروەردەی بکەین و پێی ببینین و دڵ و گیان و ڕۆحی پێ ڕۆشن نیشان بدەین، چونکە ئەگەر ئەوە نەکەین و نەتوانین حەقیقەت ببینین ئەوە باشتر وایە کە ئەو چاوە کوێر بێت، وەك دەڵێت:[8]

آدمی دیدست باقی پوستست
دید آن است که دید دوستست
چون که دید دوست نبود کور به
دوست کو باقی نباشد دور به

کەواتە مرۆڤ بۆئەوەی بتوانێت بەراستەقینە ببینێت و بەدوای حەقیقەتەکانەوە بێت ئەو ئەزموون و ڕێگە و وەسیلانە بگرێتە بەر کە خزمەت بە دۆزینەوەی خۆی دەکەن تا بتوانێت بە بوونی راستەقینەی خۆی جیهان و ژیان و وێنایەکی نوێ بۆ خۆی دروست بکات و تێیدا

سەرقاڵی جگە لە راستی و بینین و وێنای راستەقینە، خۆی بە هیچی پێچەوانە و دژی ئەوەوە خەریك نەكات، هەربۆیە بۆ ئەم وێناکردنە دەبێ سەرەتا مرۆڤ لەخۆیەوە دەست پێ بکات و لە ناو جەستەیەکی سنورداری بەرتەسك بێتەدەرەوە و بچێتە ناو جیهان و عالەمێکی ترەوە کە بریتییە لە حەقیقەت و مەعنەوییەت، وەك (حافظ) کە لەم بەیتەدا گۆڕانکاری ڕیشەییمان بۆ ئەم مەبەستە بۆ دەستنیشان دەکات و ئەوە دەخاتە ڕوو کە چی دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئێمە بتوانین پەی بەو جیهانە نادیار و فراوان و گەورەیە ببەین ، تا بتوانین بەگەورەیی لە گەورەیی و جوانییەکان بڕوانین وەك دەڵێ:

از در بدر آمدم و از خود بدر شدم
گویی از این جهان به جهان دگر شدم

لە ڕوانگەی ئەوەی کە تا ئێستا باسکرا و خرایەوە ئیتر دەبێ ئەوەمان بۆ دەرکەوتبێت کە جیهانی نادیار و نەبینراو و شاراوەی بابەت و شتەکان زۆر فراوان و بێ سنورە و، بە خۆ بۆ ئامادەکردن و خۆ پەروەردەکردن بە وانە و بابەتەکانی قوتابخانەی وێناکردن دەتوانین بچینە ناو ئەو عالەمە گەورەیە و تا ڕادەیەك ئاشنای هەندێك لایەن و گەوهەر و ماهییەتی شت و بابەتەکان بین و، ئیتر ئەوەمان لا ڕوون بێت ئەوەی کە لەپێش بینایی چاوی سەرمانەوەیە هەموو ئەو شتە نییە کە دەیبینین و لە حەقیقەتدا هەیە، بەڵام ئێمە هێشتا لە جیهانی دەرەوەدا هەر خەریکی مامەڵەین، هەربۆیە دەبێ ئەوە بزانین کە مامەڵەمان و خوێندنەوەمان بۆ

جیهانی دەرەوە چۆنە، چونکە (( هەمووکەس دنیای دەرەوە بەو شێوەی دڵی دەبینێت واتە دڵی چۆنە ئەویش وادەبینێت و،کاردانەوەی فەرمانەکانی دڵیشی لە دەرەوەدا بەپێچەوانە یان ئاوەژووە دەبینێت.)) استاد الهی، آثار الحق[9] ئەمەش ئەوەمان بۆ دەخاتەڕوو کە تەنانەت لە خوێندنەوەمان بۆ جیهانی دەرەوە دەبێ بزانین چاوی دڵمان چۆن دەبینێت و، کاردانەوەی ئەو خوێندنەوەوە و بینینانە لەناو دڵ و ناخ و هەروەها دەرەوەماندا بەچ شێوەیەکە، چونکە ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە وێناکردن کاریگەرییەکەی تەنیا پەیوەندی بە بەشێکی مرۆڤەوە نییە بەڵکو هەموو بوون و وجودی مرۆڤ دەگرێتەوە و کاریگەری لەسەری دەبێت، چونکە ئەوە شتێکە کە کار لەسەر بیر و تێرامان و فەرمان و کاردانەوەکانی مرۆڤ دەکات و هەموویان وا لێدەکات تا بە ئاراستەی حەقیقەت بینی و حەقیقەت دۆستی و ئاراستەبڕینی راستەقینە گەشەبکەن و ژیانی مرۆڤ پڕ بکەن لە مەعنەوییەت و زیندوویی و جوانبینی و ڕۆشنبینی.

کەواتە دەتوانین بەجۆرێکی تر ئەوە بخەینەڕوو و بڵێین بۆ هەموو کەس ئەو دەرفەت و هەلە دێتە پێشەوە کە باشتر پەی بە وجودی خۆی ببات و ، بوون و وجودی خۆی کامڵ بکات، تا بتوانێ و ئەوە بێنێتەدی و شیاوی ئەوەبێت کە بەختەوەری پێببەخشرێت یان دەستی بکەوێت. بەم پێیە ڕوانینی مەعنەوی ئەوەیە کە هەست بەوە بکەین و بزانین کە هەموو شتەکان دەستیان لەناو دەستی یەکتردایە تا هەموو پێکەوە ئێمە بخەنە مەوقعیەت و زەمینەو بارودۆخێکەوە، کە تێیدا ئەوکاتەی کە خۆمان مەیلمان هەبوو بتوانین بەگوێرەی توانا لە مەسیر و ڕێڕەوی فیترەتی راستەقینەماندا بجوڵێنەوە و هەنگاوهەڵگرین. لێرەوە دەکرێ ئەوە بڵێین

کە ڕوانین و چاوی مەعنەوی بە مانایەکی گشتی، شتێك نییە جگـە لـە هەڵگواستن و هەڵێنجانی مانا و ڕوانین و وێنای شت و بابەتەکە لـەلایـەن کەسەکەوە.[١٠]




سەبارەت بە پاك هێشتنەوەی چاوی دڵ و بینایی چاو بۆ بینـیـنـی ڕاستەقینە و گرنگیدان بە چاو و وێناکردن وناسینی زەمینە مـەیـدانـی مامەڵەکردنی چاو و ئاگاداربوون لە خود و دەورووبەری پـەیـوەسـت بـە چاوی دڵەوە مەولانای ڕۆمی دەڵێت[١١]

یار چشم توست ای مرد شـــکار
از خس و خاشـــاك انرا پاك دار
هین به جاروب زبان گردی مکن
چشم را از خس راه آوردی مکن
هست خاشاك تو صورتهای فکر
دم بدم در می رسـد اشکال بکر

واتە چاوی وێنا و بەصیرەت یاری تۆیە و، تۆش هـەوڵـبـدە ئـەم هاودەم و یارە بە پیسی و خۆڵ و خاشاکی دەربڕین و بیر و وەسفکـردن و خۆدەرخستن و خۆ نیشاندان ئالودە و لێڵ مەکـە. دەبـیـنـین لـە دێـڕی دووەهەمدا زمان کە ئامرازی قسەکردن و دەربرینە دەیچوێنێ بە گسکێك کە خۆڵ و خاشاکی وەهم و خەیاڵی پوچ هەڵدەگرێت و دەیکاتە چاوەوە و، بینایی و وێناکردنی چاو پڕدەکات لە خاشاك و ئیتر وێنـاکـردن لـێـل و ناتەواو دەکات و نایهێڵێت.[١٢] دەکرێت بڵێین لـەم دێـڕە هـۆنـراوەیـەی (مەحوی)یشدا دیسانەوە مانای سەرەکی دووبارە دەبێتەوە، کە برێتییە لە ئاگاداربوونی چاو بەوەی کە تووشی ئەو بەڵایانە نەبێت و بینایی خۆی لـە دەست نەدات و، بە شتێك کاری تێبکرێت یان وێنەیەك بگوازێتـەوە کـە مایەی ئاسودەبوون و پاك راگرتنی چاو بێت، نەك ئەو شتانەی کە خەوشن و هەم بینایی لێڵ دەکەن و هەم گیان دەخەنە ئـازار و ئـەشـکـەنجـەوە (هەرچەندە ئەم دێڕە بۆ مانایەکی تایبەتتر هاتووە بەڵام دەکرێت ئەوەشـی لێ بخوێنرێتەوە) وەك دەڵێت:

دەوری هەر چاوێکی ئەمڕۆ داوە صەد فەوجی بەڵا
دین و دڵ یەغما دەکەن، چاری کەن ئەی شێخ و مەلا ل۲۷

ئەوەی تا ئێستا خستمانەڕوو بریتی بوو لە وێناکردن و چۆنیەتی وێناکردن و، دەسخستن و پەروەردەکردنی ئەو بنەما و کارە سەرەتایی و سەرەکییانەی کە بۆ وێناکردن پێویستن، هەروەها ئەوەش خرایە ڕوو کە مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ شت و بابەتەکاندا چۆنە و لە کوێوە خوێندنەوەیان بۆ دەکات و چ شتێکی ئەوان دەخوێنێتەوە و، ئێمەش دەبێ لە چ بازنەیەکدا بین تا بتوانین چاوی دڵمان کراوە و بینا بێت و، وێنای وێناکردن هەردەم لە پێش چاوی دڵ و ژیانمانەوە بێت.

لێرە بەدوا بەکورتی ئەوەدەخەینەڕوو کە بزانین ئایا شاعیری گەورەی کورد "مەحوی" چۆن وێنای بابەت و بوون و شتەکانی کردووە. کامەیە ئەو چاوەی کە "مەحوی" شتەکانی پێ بینیوە؟ ئایا تەنیا چاوی سەری بەکارهێناوە یان چاوی دڵی کردووە بە بینایی بۆ چاوی سەر؟ چی ئەو چاوەی بە مەحی بەخشیوە؟ ئەمانە کۆمەڵێك پرسیارن دەکرێت تاڕادەیەك هەندێکیان وەڵام بدرێنەوە.

بێگومان وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە هەروا کارێکی سادە و ئاسان نییە، بەڵکو پێویستی بە لێوردبوونەوە و ڕامانی زۆر هەیە، تا لە ڕێگەی هۆنراوەکانییەوە بتوانین مانا و مەبەست لێك بدەینەوە و ئەوە دیاری بکەین چۆن ئەو توانیویەتی بەو شێوەیە بەوە بگات و ئەوە بخاتە ڕوو و هۆنراوەی پڕ لە مانا و مەبەستی قوڵ بهۆنێتەوە و دەرك بە هەندێك شت بکات کە تەنیا چاوی دڵ دەتوانێت بیبینێت و بیناسێت. هەربۆیە

لەسەرەتاوە ئەوە دەڵێم ئەوەی کە ئێستا دەخرێتەڕوو ڕەنگە تەنیا شێوەی مامەڵەکردن بێت لەگەڵ شیعرەکانی تا ئەگەر کرا لەباسەکانی داهاتوودا بەشێوەیەکی ورد و تەواو وێناکردن و هەروەها نمونەکان و شیکردنەوەیان بخرێتەڕوو.

(مەحوی)یش لە خستنەڕووی کاریگەری دەورووبەر و گواستنەوە و کارتێکردنی بۆسەر کەسەکە و شێوازی بینین و ناسینی زۆرجار ئاماژە بە "چاو" دەکات و، ، ئیتر ئایا ئەو وێنەیە بە بیستن گوازراێتەوە و دەرکی پێکردبێت و دواتر لەڕێگەی چاوەوە خۆی داوەتە بەر ئافراندنی و فڕینی چاو و وێناکردن، یان هەر بەچاوی سەر بینیویەتی و دواتر کاریگەری بۆ دروست بووبێت، بەتایبەت لە بینینی یاردا، کە چۆن بە بینینێك دڵ و گیانی دەکەونە ژێر کاریگەری ئەو بینینەوە، وەك:

تۆ کە دەرکەوتی، مەپرسە چیی بەسەر دێ جان و دڵ
حاڵەتی شەونم تەماشاکە بە وەقتی ڕۆژهەڵات

**د. م. ل٥٧**

ڕەنگە ئەمە خوێندنەوەیەکی ڕووکەشییانە بێت، ئەگەر بڵێین تەنیا بینینێك بەوشێوەیە کاریگەری دەنوێنێت، چونکە بینین خۆی بە تەنیا ئەمە دروست ناکات، بەڵکو شتێك هەیە لە ناخدا کە یارمەتی ئەوە دەدات ئەم بینینە ببێتە هۆی ئەوە تا بەم شێوە قوڵە مامەڵەی لەگەڵدا بکات و کاردانەوەی لەسەری هەبێت، کە ئەمەش دەتوانین بڵێین پێش بەرامبەر ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە خودی مرۆڤەکەوە هەیە، کە دڵ و گیان و چاوی ئەو چۆنن و چی دەبینین و چۆن و بە شێوەیەك وێنای ئەو بینینە

دەکەن؟ کە ئەمە لەلایەن چاوی (مەحوی)یەوە ئەو دیمەنە گوازراوەتەوە بۆ دڵ و گیانی خۆی، واتە لەو دیرەهۆنراوەیەی سەرەوەدا شێوازی گواستنەوەی بینینەکە خۆویستانە بێت یان خۆ نەویستانە، بەڵام هەر لەلایەنی مەحوییەوە کاریگەرییەکەی بۆ خۆی نیشان دەدات، واتە وێنایەك لە چاو و بیری ئەودا خولقاوە و بەجۆرێك وێنای یاردەکات کە ئامادەبوونی سەرەتای ئەوەی بۆ دروست بووە تاوەکو ئەو وێنە دروست ببێت و لە نادیاریی و نەبینراوییەوە ئەو مانایە بهێنێتەوە و لەناو ناخی و چاو و دڵی مەحویدا سەرهەڵبدات و هەڵبقولێت، بەڵام ئەگەر سەرنج لەم دێرەی خوارەوە بدەین، ئەوە ڕەنگە بتوانین بڵێین تارادەیەك پێچەوانەی ئەو دیرەی سەرەوەیە و، لایەنی بەرامبەر ڕۆڵی ڕاستەوخۆی لە چەندێتی و چۆنیەتی ئەو کاریگەرییە و هەروەها وێناکردنەکە هەیە، وەك دەڵێت:

لەپڕ ئەو چاوە هەڵدەبڕێت و جەرگی عالەمێ دەبڕێ
نیە، هەر بەرقە غەمزەی دڵشکافی، بێبەریق ئەمما
ل٣٠

لێرەدا (هەڵبڕینی چاو) ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر گواستنەوەی وێنە و کاریگەری بۆسەر دڵ و گیانی بەرامبەر هەیە، بۆیە ئەو وێناکردنەی لە یەکەمدا دروست دەبێت جیاوازە لە دێڕەی دووەمدا.

جگەلەوە دەکرێت لەڕوانگەی شتێکی دیکەوە کە تەنانەت پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە بابەتەکەوە نەبێت، بەڵام هەر ببێتە هۆی بیرکەوتنەوەی بابەتی سەرەکی، کە زۆرجار خودی مرۆڤەکە خۆی لەناو دڵ

و دەروون و بیری خۆیدا ئەو وێنەی بۆ دەخولقێنێ، ئەمەش لەو ڕوانگەوە کە زۆرجار سیفەتێك یان شتێك کە دەکرێت لەو ساتەدا ئامادەبوونی هەبێت یان نا، شاعیر لەو ڕێگەوە وێنای ئەو شتە دەکات و زۆر شتی تری پێوە دەبەستێتەوە، کە ئەمەش یەکەمجار بۆ هۆکارەکە ڕەنگە چاوی سەر بەکاربهێنێت، بەڵام دواتر بە چاوی دڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکات و دەیبینێت و وێنای دەکات. هەرچەندە هەندێك جار بەپێچەوانەی ئەوە ڕوودەدات و بەرامبەر وانیشان دەدات کە مەبەست ڕووی نادیار و مەعنەوییەتی شتەکان بێت و، دەسەکەوتنی گەوهەری مانا و چییەتی لا مەبەستە کەچی لەهەمان کاتدا ڕووکەشەکان دیوی ئەودیوی شتەکانی لێ ون دەکەن و، چاوی ناتوانێت بەرەو وێنای مانای ماهییەت و حەقیقەتی شت و بابەتەکان بڕوات، بۆ نمونە لەم بەیتەدا ئەوە دەخاتەڕوو کە لە بنچینەدا وێنای ژیانی مەعنەوی و حەقیقی دەوێت، کەچی بەدوای ماددییات و ڕووکەشەوەیەو و وێنای ڕاستەقینەی لێ ون بووە :

قسە و باست لە عیرفانە، کەچی دنیایە مەنظورت
لە عینوانی جەواهیر جۆیایی و ڕوو لە ئەعراضی
ل٣٠٥

مەحوی لە ئاماژەدان بە چاوی سەر و چاوی دڵ نمونەی زۆری هەیە، ئەمە جگەلەوەی کە دەتوانین بڵێین بینینی زۆرێك لە شتەکانی بە هۆی چاوی دڵەوە بووە ئەمەشە وایکردووە کە هۆنراوەکانی مانای قوڵ و وێنای ماهییەتی شتەکانی لێ بخوێنرێتەوە.هەروەها لە ئاماژەدان بەوەی کە

سنوری چاوی سەر کەمەو سنوورداره و ناتوانێت بینینەکانی مەودایەکی زۆرببڕێت ئاماژه بە چاوی دڵ دەکات و ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئەگەرچی چاوی سەری نەتوانێت ئەو ببینێت، بەڵام چاوی دڵی دەتوانێت بیبینێت، بۆنمونە:

غائیب لە دیدە، چاوی سەرم، دڵمە پێتەوە

دەستم بە ئاسمانەوە، چاوم بە ڕێتەوە

**ل٢٨٥**

دەکرێت لێرەدا ئەوە بڵێین کە مەوداو سنوری چاوی دڵ دەتوانێت مەوداو سنوری چاوی سەر ببڕێت، بەڵام پێچەوانەکەی دروست نییە، هەربۆیە ئەگەر چاوی سەر توانای ئەوەی نەبێت ببینێت یان نەتوانێت ئەو مەودایە ببڕێت ئەوا گرفت نییە، چونکە مەودای چاوی دڵ زۆر فراوانە و دەتوانێت بە وێناکردن ئەو بینینەی کە پێویستە بە دڵ و گیانی ببەخشێتەوە.

تەنانەت (مەحوی) لە دێڕێکی تردا زۆر بەجوانی و بە ڕوونی ئاماژه بەوە دەکات ئەگەر هات و چاوی سەری لەدەست دا، ئەوا چاوێکی بیناتر لەو شك دەبات کە چاوی دڵە، چاوێکە هێندە مەودای بینیی فراوانە کە ئیتر بە مامەڵەکردن لەگەڵ جیهانێکی تری بۆ وێنا دەکات و، ژیانێکی نوێی پێ دەبەخشێت، وەك دەڵێت:

خودا بیدا بە ڕەحمەت، داغی دڵ چاوی دڵە (مەحوی)

بە گریە چاو ئەگەر چو، شك دەبەم چاوێکی بیناتر

**ل ١٢٧**

بە خوێندنەوەی وردی دیوانی (مەحوی) ئەوەمان بۆ دەرکەوێت کـە ئەو زیاتر چاوی دڵی بۆ بینینی شتەکـان و دەرکـکـردن بـە ژیـان و هەبووەکانی ناوی بەکارهێناوە و، بەشێوەی زۆر ورد و جوان مـامـەڵـەی لەگەڵ وێناکردن کردووە، هەر لە باسی نیشاندانی مامەڵەی دیـنـداریمـان لەگەڵ خوا و خستنەڕووی میعراج و وەسف و باسکـردنـی سـیـفـات و کەسێتی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) و، خودی دنیا و ژیـان و ، عیشقی یار و ، وەسفی پەروانە و، عاشق و مەعشوق و.... زۆرجار یـەك بەدوای یەك وێنای وامان بۆ دەردەکەوێت کە دەکـرێـت بـە کـەمـێـك وردبوونەوەمان گەورەیی ئەم شاعیرەمان لە پـەیـبردن و وێـنـاکـردنـی شتەکانمان لای ئەو بۆ دەربخات.

لەکۆتاییدا دەتوانین بڵێین وێناکردن لای مەحوی شاعیر شتێکی زۆر ڕوون و دیارە و، ئەوە دەخوازێ کە زۆر بە گرنگییەوە و بەجیا مـامـەڵـە لەگەڵ چەمکەکان و وێناکردنیان بکەین، بۆنمونە وێنای ژیان و مەرگ و، زیندوویەتی و فەنا و، عیشق و، گەردوون و، خودناسی لای مەحوی چۆنە و چۆنیەتی وێناکردن و مرۆڤ بینی لای ئەو چۆنە؟ بێگومان ئەم بابەتـەش بێ کەم و کورتی نییە ئەویش لەبەر نەبوونی کات و دەرفەتی پێویست بـۆ قوڵبوونەوەی زیاتر و هێنانی نمونەی جیاجیا و راڤەکردنی هـۆنـراوەکـان، بەڵام هیوادارم ڕێگەیەك بێت بۆ زیاتر کار لەسەرکردن و مامـەڵـەی ورد لەگەڵ شیعری شاعیرەکانی ترمان، بـەو هـیـوایـەی لـەڕێـگـەیـانـەوە مەعریفەیکی زیاتر و تۆکمەتر بۆ خۆمان و ئەدەبی نەتەوەکەمان بخەیـنـە ڕوو و خزمەتێکی زیاتری ژیانی مەعنەوی و حەقیقیمان بکەین.



## پەراوێزەکان:

١. محمد جعفر مصفا، باپیر بلخ، کاربرد مثنوی در خودشناسی، چاپ دوازدهم، تهران١٣٨٦، ل ١٨٨-١٨٩.

٢. سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٩.

٣. دکتر رضا خسروانی، معنای عشق، چاپ سوم، ١٣٨٣. ل ١٧٥.

٤. سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٤.

٥. م.تحسین حمەغریب، کۆرسی مەولەوی، بابەتی یەکەم.

٦. دکتر رچا خسروانی، معنای عشق، چاپ سوم، ١٣٨٣.

٧. سەرچاوەی پێشوو، ل.٢٠٧

٨. دکتر مجتبی بشر دوست، سودای حقیقت،هستی شناسی مولانا در مثنوی معنوی، چاپ اول ، ١٣٨١، ل٨٧

٩. نیکبینی، ترجمە: فروزان تجویدی، چاپ دوم، ١٣٨٥، ل٤٩.

١٠. سەرچاوەی پێشوو.

١١. محمد جعفر مصفا، باپیر بلخ، کاربرد مثنوی در خودشناسی، چاپ دوازدهم، تهران١٣٨٦، ل٣٧٤

١٢. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧٤.

## سەرچاوەکان:


١. دیوانی مەحوی، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کریم، چاپی یەکەم، انتشارات کردستان، ١٣٨١.

٢. محمد جعفر مصفا، باپیر بلخ، کاربرد مثنوی در خودشناسی، چاپ دوازدهم، تهران١٣٨٦.

٣. دکتر رضا خسروانی، معنای عشق، چاپ سوم، ١٣٨٣.

٤. مجتبی بشر دوست، سودای حقیقت، هستی شناسی مولانا در مثنوی معنوی، چاپ اول ، ١٣٨١.

٥. م.تحسین حمەغریب، کۆرسی مەولەوی، بابەتی یەکەم.

٦. نیکبینی، ترجمە: فروزان تجویدی، چاپ دوم، ١٣٨٥.

## گفتوگۆ لەگەڵ ...
## پرۆفیسۆر دوکتۆر (ئیبراهیم ئەحمەد شوان)
## ئاكار ع. قەرەداغی

**سەرەتا کە "دیوانی مەحوی"م خوێندەوە دەتگوت دەقێکی بێگانە دەخوێنمەوە و گەر راڤەکەی مامۆستای مودەرڕیس نەبوایە تێینەدەگەیشتم.**

"مەحوی"، ئەو ناوە هەمیشە لەسەر زار و تاڕادەیەکی بەرچاو نامۆیە، یەکێکە لەو شاعیرە خاوەندەنگ و سیمای کوردانەی تایبەت و جیاواز لە ژمارەیەکی ئێجگار گەورەی شاعیرانمان، لە نەخشەی شیعری کوردیدا یەکێك لەو لوتکە هەرە بەرزانەی کە بۆ خۆی قۆرخکردووە کە بە ئاسانی ناتوانین بیگەینێ و ناشتوانین ئاوەها بە ئاسانی دەستبەرداری ببین. هەر ئەم تایبەتمەندییە کارێکی ئەوتۆی کردووە عاشقانی شیعری کوردی لە دەیان ساڵی پێش ئێستاوە، هەوڵیانداوە لێکدانەوەی خۆیان هەبێت بۆ شیعرەکانی و ئەو لایەنەش بکەنە گۆڕەپانێکی تاقیکردنەوە و سەلماندنی بەهرەیەکی تایبەت. هێندەش لەو بوارەدا خەڵکانی"مەحویناس"هەبوون، دە هێندە خەڵکانیدیکەی ئەوتۆ هەبوون کە تفەنگیان بە تاریکیشەوەوە ناوە و بە ئارەزووی خۆیان و بەبێ گەڕانەوە بۆ هیچ سەرچاوەیەك، تەنانەت شیعرەکانی خودی (مەحوی)ش، تاقە بەیتێکیان کردووەتە مەبەستی لێکدانەوەیەکی ئەوتۆ کە تەنها پەیوەندیی بە ناخی نووسەری بابەتەکە خۆیەوە هەبووە، نەك شاعیر.

هەڵبەتە لە هەمان کاتدا خەڵکانی دیکەش هەبوون پتر مەبەستیان ئاماژەکانی شاعیر خۆی بووە، نەك ڕەنگدانەوەی ناخی خۆیان، بەلاّم ژمارەی ئەوانەی ئاوڕیان لە شیعری"مەحوی"داوەتەوە، لە هەردوو ئاراستەکەدا، تا نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردووش، گەلێك کەم بوو.

یەکێك لەوانەی لە ماوەی بیست ساڵی ڕابوردوودا بە دوای خودی"مەحوی"دا گەڕاوە و هەوڵیداوە کەمتر دزە بە"خودی"خۆی بۆ نێو شیعرەکانی"مەحوی"بکات، پرۆفیسۆر دوکتۆر"ئیبراهیم ئەحمەد شوان"ە.

ژیاننامەی ئەم مامۆستایە ژێرخانێکی تێکەڵ لە خوێندنی ئایینی و خوێندنی فەرمیی قوتابخانەکانی سەردەمی خۆیمان پیشاندەدات. لە ساڵی ١٩٥٠، لە ئامێزی بنەماڵەیەکی ئایینی لە گوندی"گرد عازەبان"ی سەر بە ناحیەی"قوشتەپە" لەدایکبووە. لە ساڵی ١٩٧١دا بە مامۆستای سەرەتایی دامەزراوە. لە ساڵی ١٩٨٦ بەشی کوردیی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددینی تەواوکردووە و لە هەمان زانکۆشدا، لە ساڵی ١٩٨٩دا ماستەری لە (لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی بەشێك لە دیوانی"مُخلص") وەرگرتووە. لە ساڵی ١٩٩٦یشدا لەسەر تێزی (شیعری ئایینی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردییەکانی مەحوی) وەرگرت. لە ساڵی ٢٠٠٨/ ەوە پرۆفیسۆرە و، تائێستاش بەردەوامە لە مامۆستایەتی لە بەشی کوردیی کۆلێژی زمانی هەمان زانکۆدا.

ئەمە ئەو لایەنەی ژیانی پرۆفیسۆر دوکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوانە کە بۆ ناساندنی کەسایەتیی خۆی پێویستن، بەلاّم هێندەی پەیوەندیی بە"مەحوی"یەوە هەیە لە ژیانی ئەم بەڕێزەدا، لەو کورتە ئێجگار چڕەش شاراوەترە. ئەم پرسیارانە کە بە پۆستی ئەلیکترۆنی بۆ مامۆستا نێردان،

چرای ئێمە بوون بۆ روونکردنەوە و خستنەپێشچاوی ئەو لایەنە. فەرموون ئێوە و پرسیار و وەڵامەکان:

**- با لە دکتۆرانامەکەتانەوە دەستپێبکەین کە لەسەر"مەحوی"یە، ئایا خۆتان ئەو شاعیرەتان هەڵبژارد یا بەشی کوردی بۆی هەڵبژاردن؟، ئەگەر خۆتان هەڵتانبژاردووە، ئایا دەکرێ باسی چیرۆکی ئەو هەڵبژاردنە بکەن: لەکەیەوە ئاشنای شیعرەکانی"مەحوی"ن؟ چۆن بواری سۆفیگەریتان لە شیعرەکانیدا هەڵبژارد!؟، کێ لە مامۆستاکانتان لایەنگرتان بوو و تاچەند پێتانوایە لە سۆفیگەریی لای"مەحوی"رۆچوون و تا چەند بوار ماوە ئەو لایەنە، هەر لای مەحوی خۆی، بۆ ماستەرنامە و تێزیدیکەی دوکتۆرا هەڵببژێردرێتەوە؟.**

+ لەبارەی ناونیشانی دکتۆراکەم"شیعری ئایینی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردییەکانی مەحویدا" خۆم هەڵمبژارد و دەستی بەشی زمانی کوردی و هیچ کەسێکیدیکەی پێوە دیارنییە.، هەڵبژاردنەکەش لەوەوە هات کە لە کاتی نووسینی نامەی ماستەرەکەم لەسەر (مُخلص) ئاشنایەتیم لەگەڵ دیوانی (مەحوی) پەیداکرد و بەپێی توانای ئەو سەردەمم هەوڵمدا بەراوردێ (بەرامبەرییێ) لەنێوان موخلیس و مەحوی بکەم و چەند لێکچوونێکم لەنێوانیاندا بەدیکرد.سەرەتا کە دیوانی (مەحوی)م خوێندەوە دەتگوت دەقێکی بێگانە دەخوێنمەوە و گەر راڤەکەی مامۆستای مودەڕیس نەبوایە تێینەدەگەیشتم.

دوای ئەمە بەرەبەرە زیاتر ئاشنایەتیم لەگەڵ دیوانەکە پەیداکرد و ئەوەبوو دوای تەواوکردنی کۆرسەکانی دکتۆرا ئەم ناونیشانەم بە خەیاڵدا

هات و بۆ ئەمەش پرسم بە چەند مامۆستایەکی خۆم کرد، لەوانەش بەڕێز د. محەممەد نوری عارف کە رابەری نامەی ماستەرەکەشم بوو، ئەویش رەزامەندیی خۆی دەربڕی و پێی کارێکی چاکبوو. پاشان سەردانی خوالێخۆشبوو (د. مارف خوزنەدار)م کرد و باسی ناونیشانەکەم لەگەڵ کرد و ئەویش گوتی: (شیعری مەحوی نە من و نە رابەرەکەت و نە تۆش تێیانناگەین)، لە وەڵامدا گوتم: هیوادارم من تۆزێکی تێبگەم. بەمەش نەوەستام و سەرم لە بەڕێز (د. عیزەدین مستەفا)دا ئەویش پێی کارێکی چاکبوو و گوتی: ناونیشانەکە و بابەتەکە لەگەڵ تۆ دەگونجێت.نامەکەشم تەنیا سۆفیگەری نییە، بەڵکو لە سێ بەشی سەرەکی پێکدێ: بەراورد و شیعری ئایینی و سۆفیگەری، بەڵام زیاتر لایەنی تیۆری و پراکتیکەکەی بەلای سۆفیگەریدا شکاوەتەوە.

بە قەناعەتی خۆم تاڕادەیەکی باش لەلایەنی سۆفیگەریی مەحویم کۆڵیوەتەوە و هەموو بۆچوونەکانم بە نموونەی شیعری پشتئەستوور کردووە و لایەنی ئینشاییم پشتگوێخستووە، چونکە ئەوانەی پێش من لەسەر مەحوییان نووسیوە بە زۆری شێوازی ئینشایی بەسەر نووسینەکانیاندا زاڵە و زۆرکەم باسی سۆفیگەرییان کردووە.

جگەلە نامەی دکتۆراکەم شەش باسی زانستییدیکەم لەسەر مەحوی نووسیوە و لە کتێبی (مەحوی نامە)دا کۆکراونەتەوە و چاپکراون، هەروەها چەند نامەیەکیدیکەی ماستەر و دکتۆرا لەسەر مەحوی نووسراون دوای من، بەڵام لەبارەی سۆفیگەرییەوە نین. وابزانم ئێستا نامەیەکی دکتۆرا لەسەر (حەق و حەقیقەت لای مەحوی) دەنووسرێت و لە تەواوبووندایە و پێدەچێ بابەتی سۆفیگەری و عیرفان

بگرێتەوە.هەر چەندە مەحوی بەم دواییە زۆری لەسەر نووسراوە، بەڵام بوار هەر ماوە کە لەسەر هەموو شیعرەکانی بنووسرێت، چونکە مەیدانی ئەدەب فراوانە وبێکۆتاییە، جا ئەو بوارانە زمانی بێت، رەوانبێژی بێت، یاخود لایەنەکانی هزری نێو دەقە شیعرییەکان بێت.

**- گەورە شاعیرانی کورد کە سۆفی بوون و شیعری بەرزیان بە زمانی کوردی هەیە زۆر کەمن، لەوانە:"مەلای جزیری"،"مەولەوی"و"نالی"[1] بەرچاوترینیانن. شیعری سۆفیگەریی"مەحوی"لە چ شوێنێکی ئەم سێگۆشەیەدا جێیدەبێتەوە!؟.**

+ ئەو سێکوچکەی کە جەنابتان دیاریتانکردووە، بەلای منەوە شاعیری سۆفییدیکەمان هەیە کە زیاتر شایانی ئەوەن مەحوییان لەگەڵ بەراوردبکرێت. پێموایە (نالی) (١) سێکوچکەیە بە دەرە و سۆفی نەبووە، راستە لە شیعرەکانیدا زاراوەی سۆفیانەی بەکارهێناوە و شیعری دژی دەروێشیزمی و سۆفیانەی هەیە، بەلاّم سەر بە تەریقەت نەبووە و سلوکی نەکردووە، ئەو شیعرانەش کە وشەی سۆفییانەی تێدایە لە چوارچێوەی ئایینییەکەوە دەرنەچووە. (مەولەوی)ش هەرچەندە لەسەر رێبازی نەقشبەندی بووە و موریدی شێخ عوسمانی تەوێڵە بووە، بەلاّم لە شیعرەکانیدا هێندە بەلای سۆفیگەریدا نەچووە و وەسفی سۆفیانەن. راستە سەرەتاکانی سۆفیگەری لە شیعرەکانیدا بەرچاو دەکەون و چەندەها نامەی شیعری بۆ رابەرەکەی دەنووسیێ و میانەی لەگەڵیدا خۆشبووە، کەچی نەچووەتە قووڵایی سۆفیگەرییەوە وەك ئەوەی لە شیعری مەحویدا

هەیە.. کەواتە پێموایە ئەو سێکوچکەی کە دەتوانین شوێنی مەحوی لەنێوانیاندا دەستنیشانبکەین (بابا تاهیری هەمەدانی و مەلای جزیری و شێخ نوورەددینی بریفکانی)یە.

بابا تاهیری هەمەدانی (١٠٠٠ – ١٠٥٨ع (٢)) سۆفیەکی فەلسەفیی سەردەمی خۆی بووە و بەرەو یەکێتی بوون و یەکبوون و فەنا یەکێتی ئایینەکان چووە و بەدووبەیتەکانیبیروباوەڕی سۆفیانەی خۆی دەربڕیوە. مەلای جزیریش (١٦٤٠ع) بەهەمانشێوە یەکێك بووە لە سۆفییەکان و ئاماژەی بە لایەنە فەلسەفییەکانی سۆفیگەری کردووە وبە شاعیری یەکێتیی بوون ناوبانگی دەرکردووە،بەلاّم یەکێتیی بوونی ئیسلامی نەك فەلسەفی، هەروەها ئاماژەی بە یەکێتیی ئایینی ئیسلامی کردووە و پێیوایە خودا لە هەمووشوێنە پیرۆزەکان دەپەرسترێ، بۆیە ئامادەیە لە لالش کڕنۆش بۆ میحرابی برۆی یار بەرێت، ئەمە جگەلە یەکبوونی سۆفیانە و فەنا و بەقای دوای فەنا.

شێخ نوورەدینی بریفکانیش (١٧٩٩ع) شاگردێکی بە توانای مەلای جزیری بووە و لە یەکێتیی بوون و یەکبوونی سۆفییانە چاوی لە جزیری کردووەتەوە و لە داڕشتنی شیعریدا بە توانا بووە، بەلاّم لە رووی تەریقەتەوە جودا بووە و شێخێکی رێبازی قادری بووە جزیریش نەقشبەندی بووە.

(مەحوی، ١٨٣٠ – ١٩٠٦ع) یەکێك بووە لە سۆفییەکانی نەقشبەندی و شێخ بەهائودین رابەری بووە، ئەویش وەکو بابا تاهیر و جزیری و بریفکانی لە زانستی سۆفیگەریدا بالاّدەستبووە و وەکو ئەوان بەرەو لایەنەکانی سۆفیگەریی فەلسەفی هەنگاویناوە. ئەوەی مەحوی

لەوان جودادەکاتەوە ئەوەیە کە (مەحوی) بەئاشکرا شەریعەت دەکاتە ڕێگایەك بەرەو حەقیقەت، واتا: پێیوایە پەیڕەویکردنی شەریعەت مرۆڤ دەگەیەنێتە خواناسین، هەروەك دەڵێت:

ڕێگەی هودا تەریقەتی عیشقە دە (مەحویا)
وەرن و پیا بڕۆن و (وصلّوا على الرسول)
هەر ئەم تەریقە بوو بە هەموو سەحبی گرتییان
ڕۆیین پیا هەتا گەینە مەرتەبەی وسول

لێرەدا مەرتەبەی رسول گەیینە بە خودا و ناسینی خودایە، هەروەها لە شوێنێکیدیکەدا دژی سەفسەتە دەوەستێ و شەریعەت دەکاتە خۆرێکی رووناك بۆ رۆشنکردنەوەی رێگەی موسڵمان:

خورشیدە موعجیزەی شەرع، زوڵماتە سەفسەتەی پووچ
ئیسلامییان هەموو دین، یۆنانییان هەموو دوون

لە شوێنێکیدیکە (مەحوی) هەم دەبێتە لایەنگری حەللاج لەسەر گوتەی (انا الحق)و هەم سەرزەنشتیشیدەکات کە دەبێتە لایەنگری لەوەوە دێت کە حەللاج گەیشتووەتە پلەیەکی رۆحانیی وەها کە هەست بە بوونی خۆی ناکا و وادەزانێ لە بوونی رەهادا تواوەتەوە کە لۆمەشی دەکات لەبەرئەوەیە چونکە ئەو یەکبوونەی (اتحاد) کە حەللاج گوتوویەتی راستەقینە نییە و خۆی وا هەستدەکات، چونکە کە دوو شت بوونە یەك

ئەوا هەریەکە لەوانە سیفەتی خۆیان گومدەکەن و سیفەتیدیکە وەردەگرن. بۆ خوداش ناشێت کە گۆڕانی بەسەردا بێت، بۆیە مەحوی دەڵێت مەجنوون شێتە گەر بڵێ لەیلام، واتا حەللاج شێتە گەر بڵێ: من خودام. مەحوی لەمبارەیەوە دەڵێت:

با حەقیشی بێ لە بۆ مەنسوور (أنا الحق) حەق نییە
شێتییە مەجنوون ئەگەر بێ نازی لەیلایی بکا

- کاریگەریی شیعری سۆفیگەری و عیرفانیی ئێران بەسەر هەموو شاعیرانمانەوە دیارە. هێندەی پەیوەندیی بە"مەحوی"یەوە هەبێت، تا چەند لەم هاوکێشەی کاریگەرییەدا بە لاساییکردنەوەوە خەریکبووە و تا چەند داهێنەرە!؟ تکایە بە نموونەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە؟

+ مەحوی لە شیعرەکانیدا کاریگەریی هەندێ شاعیری سۆفیی فارسیی لەسەر بووە، لە هەندێکیاندا شیعری ئەوانی وەرگرتووە و تێهەڵکێشی شیعرەکانی خۆی کردووە، بۆ نموونە:

مەحوی و سەعدی شیرازی:
لەم بەیتەی خوارەوەدا عەجزی بەیتەکە هی سەعدییە:

تۆ مەڵێ یەك مەرتەبە، سەد مەرتەبە
"دُشمن دانا بِە أز نادان دوست"

مەحوی و حافیزی شیرازی:

لەم بەیتەشـــــدا عەجزی بەیتـــەکە هی حافـیـزە و مـەحـوی وەریگرتووە و تێهەڵکێشیکردووە:

دەزانیٚ رۆژە ئەو، من شەو، کەچی پێشمدەڵیٚ (مەحوی)
(حضوری طر همی خواهی مشو (حافظ) از او غایب)

مەحوی و مەولانای رۆمی:

مەحوی پێنجخشتەکییەکی نووسیوە و بەیتێکی تێهـەڵـکـێـشـی شیعرەکەی کردووە و پێنجخشتەکییەکەش فارسییە:

پـس هـمان به هـردم اری"محویا"
رو بســـوی بـــارگـــاه کـــــبریا
با دو سد زاری از این شه خواهیا
"ای کـــرامت بخش جـــان أولیا"
"یا بـکش، یا باز خوانم، گو بیا"

لەم تێهەڵکێشانەدا داهێنان بەدیناکرێ و تەنیا کاریگەریـی ئەو شاعیرانە لەسەر مەحوی بووەتە هۆی ئەم وەرگرتنە شیعرییە.

لە قۆناغی دووەمدا (مەحوی) کاریگەریی شاعـیرانـی سـەرەوەی پێوەدیارە و ناوەناوە بیرۆکەی شیعرەکانیانی وەرگرتووە و لەناو دەقەکانـی خۆی تواندوویەتییەوە، ئەگەر یەکێکی شـارەزا نـەبـیٚ هـەسـت بـەم دەقئاوێزانییە ناکرێت. مەحوی لێرەدا دەستڕەنگینیی خۆی نیشـانـداوە و داهێنانی شیعریی هێناوەتەئاراوە. بۆ نموونە:

**مەحوی**

دەپرسی بۆچی من دەرکەوتم و دڵ بوو لە تۆ غایب
کە وەختی رۆژهەڵات، ئەڵبەت دەبێ شەونم لە خۆ غایب

**سەعدی**

چون تو حاضر میشوی، من غایب أز خود میشوم
بسکه حیران می بماند وهم در سیمای تو

**مەحوی**

زوبانی حاڵی پەروانە لە وەختی سووتنا دەیوت
کەسێ وارییمـــە وەك من بێ، لە عیشقا خۆ بسووتێنێ

**سەعدی**

ای مرغ سحر عشق ز پروانه بیاموز
کان سوختەرا جان شد و اواز نیامد

لەم بەیتانەی مەحویدا داهێنانی شیعری خۆی دەنوێنێ و بە قەناعەتی خۆم لەوەی سەعدی بەرزتر خۆیان نواندووە.

**مەحوی**

لە ئولکەی عیشقەدا بۆ هەرکەسێ سەرداریيە مەنزور
عولووی مەرتەبەی سەردارە، بۆتە پەیڕەوی مەنسور

**حافظ**

گُفت ان يار كزو گشت سر بلند
جُرمش ان بود كه أسرار هويدا كرد

**مەحوی**

لە قاپی عیشقەدا وەك شاهە بەندە
لەسەر خوانە چ مەتبووع و چ تابیع

**حافظ**

گدائی در جانان بسلطنت مفروش
كسی ز سايةٔ اين در بافتاب رود

ئەم بەیتانەش رەسەنایەتیی خۆیان ون نەکردووە و تەنیا تارمایی بیرۆکەی حافزیان پێوە دیارە.

**مەحوی**

خودا بیدا بە رەحمەت، داغی دڵ چاوی دڵە (مەحوی)
بە گریە چاو ئەگەر چوو، شك دەبەم چاوێکی بیناتر

**مەولانای رۆمی**

ديدةٔ تن دايما تن بين بود
ديدةٔ جان جان ثُر فن بين بود

**مەحوی**

دەبێ هەرموو زوبانێ، هەر زوبانێ داستانێ بێ

بکەم نەختێ بەیانی ناکەسیی خۆ بەو زوبانانە

**مەولانای رۆمی**

گر ســــــــر هر مو یابد زوبان

شُکُرهایی تو نیاید در بیان

لێرەشدا مەحوی لاساییکەرێکی کوێرانە نەبووە و لە داهێنـانـی خـۆی نەکەوتووە و بەیتەکانی پانتاییەکی زۆری واتایی داگرتووە و گەر لەوانـەی مەولانا بەرزتر نەبن ئەوا نزمتر نین.

هەر بۆ نموونە دوا بەیتی مەولانای رۆمی ئاماژە بەوە دەکـات کـە ئەگەر شاعیر بە قەد مووەکانی لەشی زوبانی پێوە بێ و سوپاسی خـوای پێبکات، ئەوا هێشتا سوپاسەکانی کەمن بە نیسبەت نیعمەتەکانی خـوا و شایستەی مەقامی بەرزی خودا نـین. بـەڵام (مـەحـوی)مـەودایـەکـە فراوانتردەکا و ئەگەر زوبانی مووەکانی هەموویان داستانێ بنووسن ئـەو کاتە دەتوانێ باسی ناکەسی و ناشوکرانەی خۆی بکات بەرامبەر خـودا. واتا:مەحوی ناڕاستەوخۆ باسی ئەوە دەکات کە بە هیچ جۆرێ نـاتـوانـێ سوپاس و ستایشی خودا بکات لەسەر نیعمەتە زۆر و زەوەندەکانـی"إلهـي لا أُحسي ثناءاً عليك أنت كَما أحسيتَ على نَفسِـك". هەر بـەم جـۆرە بەیتەکانیدیکە لەبەر قەڵەمدرێژی نەمویست هێندە لەسەریان بنووسم.

**- لە دوای مەحوییەوە چەند شاعیرێکمان هەن کاریگەریی ئەویان، لە رووی ناوەرۆکەوە، زۆر بە روونی دیارە، لەوانە"بێخود"و"سابری"، تا چ رادەیەك دەتوانرێ باس لە گەورەیی و فراوانیی ئەو کاریگەرییە بکرێت!؟ ئایا دەتوانرێ، بۆ نموونە، باس لە "قوتابخانەی شیعریی مەحوی"بکرێت یا نەء؟**

+ (مەحوی) تاکە سوارەی شیعری سۆفیگەری سەردەمی خۆی بووە و شۆڕشێکی رۆحیانەی خستووەتە جیهانی شیعری کوردییەوە، پێشەوایەتیی بزووتنەوەیەکی‌شیعری کردووە و لە دوای خۆی چەندەها شاعیری بە توانا لە هەوڵی ئەوەدا بوونە چاو لە (مەحوی) بکەنەوە و لەسەر شێوازی ئەو شیعری ئایینی و سۆفیگەری بنووسن.

لەو شاعیرانەی کە شوێنپێی مەحوییان هەڵگرتووە مەلا محەممەدی خاکی و حەمدی و سابری و سەید ئەحمەدی نەقیب و.. هتد. ئێستاش بە کورتی کاریگەریی مەحوی لەسەر ئەم شاعیرانە دەستنیشاندەکەین:

### ١) مەلا محەممەدی خاکی ١٨٣٩ – ١٩٠٨:

(خاکی) لە سەردەمی مەحوی ژیاوە و لەلای ئەویش خوێندوویەتی و واپێدەچێ (مەحوی) لە وانەکانی شەرعی مامۆستای بووە، بەڵکو لە شیعریش.

دیارە قەسیدەی (بەحری نوور)ەکەی مەحوی کاری لە خاکی کردووە و ئەویش (قەسیدەی نوور)ی نووسیوە کە ناونیشانەکان لێکنزیکن و لەسەر هەمان بەحری عەروزیی مەحوی شیعرەکەی

هۆنیوەتەوە کە (بەحری هەزەجی هەشتی تەواوە)و سەرواکانیشیان یەکن.
ئەمەش سەرەتای هەردوو قەسیدەکانە:

**خاکی**

ببارێنێ خودا بارانی هەرچی فەیز و ئیحسانە
لەسەر ئەو باعیثی خەلق و گوزیدەی جەمعی ئەکوانە

**مەحوی**

(وصلی الله علی) ئەو بەحری نوور و عیرفانە
کە دەرکی غەوری ناکا (غیر علم الله سبحانە)

بەڵگەیەکیدیکەش کە هیچ گومان ناهێڵێتەوە ئەوەیە کە (خاکی) لە بەیتە شیعرەکانیدا دان بەو کارتێکردنە دەنێ و لە خەرمانی شیعری مەحوی خەریکی خاکەڕۆ و گوڵ چنینە:

لە جاڕ و خەرمەنی فەضل و کەمالی (مەحوی) یا خاکی
خەریکی خاکەڕۆیە و گوڵ دەچێنێ و دانە موورانە

بەمپێیە دەتوانین بڵێین کە قەسیدەکەی خاکی لەسایەی قەسیدەکەی مەحویدا نووسراوە و هەردووکیان سەرەتا بە نەعتی پێغەمبەر (س) دەستپێدەکەن و دوایی باسی ئەو ڕووداوانە دەکەن کە لە شەوی لەدایکبوونی محەممەددا ڕوویانداوە،پاشان بەرەو موعجیزەکانی

پێغەمبەر (س) دەچن و ئینجا هەردووکیان بە شەرمەزارییەوە شیعرەکانیان پێشکەشی مەقامی پێغەمبەر دەکەن و پێیانوایە شایانی ئەو نین. ئێستاش چەند بەیتێکی لێکچوو تۆماردەکەین:

**خاکی**

(أرِني)و (لَنتَراني) با نەڵێت و نەشنەوێ مووسا
بە سائیل نادرێ ئاخر ئەوی دەرخواردی میوانە

**مەحوی**

کەلیم (أرِني) کە فەرموو هەر جەوابی (لَن تَراني) دی
موشەرڕەف بوو **محەممەد** بێ طەلەب بەو مەرتەبە و شانە

**خاکی**

لە وەسفی پاکی ئەو ذاتە زوبان لاڵە وەکو لالە
چ جێگەی (قس)و (سحبان)ە پەنا خوانی کە سوبحانە

**مەحوی**

بەیانی گەورەیی خولقی کە سێ ئایەت لە شەئنی بێ
نە مەقدووری من و تۆیە نە ئیشی (قس)و (سحبان)ە

❊❊

**٢) حەمدی ١٩٣٦:**

حەمدی یەکێکە لەو شاعیرانەی کە کاریگەریی مەحویی بەسەرەوەیە و خۆی لە چوارینەیەکیدا دەڵێ: کە مەحوی خەرمانی شیعری کوردیی تالانکردووە و دە یەکەکی داوەتە حەمدی:

خەرمانی لەفظی کوردی، کوردی کە کردی پێوان
نالی کە نالی کاسەیەکی دا بە ئەو لێوان
تاراجی کرد کە مەحوییەفەندی بە لوطفی خۆی
عوشریشی دا بە حەمدی وتی: بیبەرە دیوان

هەروەها حەمدی دوو پێنجخشتەکی لەسەر شیعری مەحوی نووسیوە و ئەمەش هەر بەڵگەی کاریگەربوونیەتی پێی.. جگەلەمانە (حەمدی) لە هەردوو غەزەلی (شەو و رۆژ)ەکەی کاریگەریی مەحویی پێوە دیارە و چاولێکەری هەردوو غەزەلەکەی کردووەتەوە کە کۆتاییان بە شەووڕۆژ دێت.

لە رووی روخسارەوە هەردوو غەزەلەکان لە بەحری رەمەلی هەشت هەنگاوی مەقسورن و دواسەروایان (رۆژ)ە و سەروایان (انە).لە ناوەرۆکیش هەردووکیان بە دوای یارێکەوە وێڵن و بەرەبەرە ئەوینەکەیان قووڵدەبێتەوە و بەرەو خۆشەویستیی پێغەمبەر دەگوازرێتەوە. لەبەر کەمیی ماوەی نووسین ناتوانم هەموو لێکچوونەکان تۆماربکەم.

**حەمدی**

مەن لەپێ کەوتم لە دووی ئەو ماهە جا نۆبەی ئەوە
کائیناتی پشکنیوە، وێڵ و سەرگەردانە رۆژ

**مەحوی**

ئەڵبەتە مەجنونی رۆژی روومەتی لەیلایەکە
موتەسیل شام و سەحەر کەوتووەتە ئەو شاخانە رۆژ

هەروەها لەو دوو غەزەلەی هەردووکیان کە دواسەروایان شەوە لە رووی روخسار و ناوەرۆك پێکدەچن.لە رووی روخسار لەسەر هەمان بەحری عەروزین، لە رووی ناوەرۆك باسی شکۆمەندیی شەو دەکەن و فەزڵی بەسەر رۆژدا دەدەن. بۆ نموونە:

**حەمدی**

کردەوەی دونیا کە هەر عەیب ئەبێ داپۆشرێ
پەردەێکی موختەسەر خاسی بەسەر دادانە شەو

**مەحوی**

ئەو سیا رۆزیی منە پۆشیویە عەیبی کەسان
ئاشکارە سەتری ئەحواڵی گونەهکارانە شەو

نموونەی لێکچوون زۆرە و لە شوێنێکیدیکە بەم بەیتە کۆتایی پێدێنم:

**حەمدی**

بۆ عەدوو بەرقی هەناسە و بەردی ناڵەم کافییە

حەربگاهو ئەسلەحە و نوظم و سوپاهم بۆ چییە

**مەحوی**

لە پاداشتی قسەی سەردا هەمە ئاهو هەناسەی گەرم

کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ من بەرقی تێ دەگرم

❊❊

## ٣) سابری ١٨٨١ – ١٩٤٤ ع:

(سابری) یەکێکە لە شێخەکانی تەریقەتی قادری و نەوەی دوای مەحوییە. وادیارە ئاشنایەتیی لەگەڵ شیعرەکانی مەحوی هەبووە و پێیانکاریگەر بووە، بەڵام وەنەبێ رەسەنایەتیی شیعری خۆی بزرکردبێ و چاولێکەرێکی کوێرانە بووبێ، بەڵکو هزری مەحویی وەرگرتووە و لە بۆتەی شیعرەکانی خۆی تواندووەتەوە و شارەزا نەبێ هەست بەم کاریگەرییە ناکات.

(سابری) لە پێنج خشتەکییەکدا کە نەعتی پێغەمبەر (س) دەکات، ئاماژە بە عەشقی *محەممەد* (س) دەکات بە وشەی (لولاك) کە حەدیسە قودسییەکەیە و پاشان دونیا دەکاتە بۆگەنی و بە کەلاکی دادەنێ (دونیا جیفەیە)، ئەمانەش هەموو لە دوو بەیتی مەحوی

وەرگیراون و وشەکانی (لولاك، دونیا جیفەیە، لاك) دووبارەبوونەتەوە، بەڵاّم بەڕاستی شاعیرانە هەڵسوکەوتی کردووە و لە داهێنان بێبەشنییە.

**سابری**

وەرە (سابر) ئەگەر عەشق و مورادت شاهی لەولاکە
تەریقی شەرع و دین بگرە لەمەولا روو لە مەولا کە
مەچۆ ئەولاوە ئەولا وایە بێ تەدبیری ئەم لا کە
کە دنیا جیفەیە هەرگیز مەچۆ نەزدیکی ئەو لاکە

**مەحوی**

دەزانی جیفەیە دونیا دە حەیفە
وەکو سەگ ئەم شەڕ شۆڕە لەسەر لاك
خودا تۆ لاگری لەو لاکە (مەحوی)
بە جاهی پادشاهی تەختی لەولاك

(سابری) لە غەزەلێکیدیکەیدا ناوەڕۆکەکەی لە مەحوی وەرگرتووە و وەستایانە وشە و زاراوەکانی مەحویی لە بۆتەی بەیتەکانیدا تواندووەتەوە،غەزەلەکە عوزرییە و باسی ئازاردانی خۆی دەکا لە لایەن یارەوە و ئاماژەش بە شیرین و فەرهاد دەکات.

**مەحوی**

بە سورمە بۆیە دولبەر خەنجەری موژگانی دا پەرداخ
دڵی هەڵناگرێ ببیێ لە کوشـتە دەنگی ئۆف و ئاخ
بە تیرێ کوشتمی، هەڵیاوەسـیم، سووتاندمی، رۆیی
دوعا بۆ حیفظی کەن، کێ دیویە جانانە وا گوستاخ
گوڵ و لالـەی کـەژ کۆ، کۆهـکەن دێنێتەوە فکرم
کە خوونی ناحەقی ئەو مەوج ئەدا ئێستەش لە کێو و شاخ

هەر لەم چوارچێوەیە (سابری) غەزەلێکی نووسیـوە و ئـێـمـەش ئاماژە بۆ چەند بەیتێك دەکەین کە بۆنی بەیتەکانی مەحوییان لێدێ:

بە قەسدی کوشتنم ئەو شۆخە وا روخساری دا پەرداخ
بـە نـاچـاری دەکـا زاری کـەسـێ وا دەیـدەنە بـەر داخ
بە بێ ئەو خەسـرەوە شـیرینە (سابر) ژینی لێ تاڵە
لەبـەر ئەو رەنجی فەرهـادی دەدا دائیم لـە کێو و شـاخ
نیشانم دەن ئـەگـەر دیتان نیشنێکە لە مـەردیتان
کە چونکە هیچ کـەس نەیدیوە قـەت ئینسانی وا گوستاخ

بێگومان چەند زیاتر دیوانەکەی (سابری) بپشکنی نموونەی زیاترت بەرچاو دەکەوێت و بەوەندە وازم هێنا.

❊❊

## سەید ئەحمەدی نەقیب ١٨٦٣ – ١٩١٠:

نەقیب لە سەردەمی مەحوی ژیاوە و (بە زۆری شوێن نالی و مەحوی و خاکی کەوتووە)،بە پلەی یەکەم کاریگەری شیعرە ئاینییەکانی مەحویی لەسەرە. نەقیب لە غەزەلی (گەورەیی شەو بەسەر رۆژدا) بیرۆکە و روخساری لە غەزەلەکەی مەحوی (شەو کەسێ پرسی لە خۆدەرختنی پەروانە شەو) وەرگرتووە و هەمان کێش و سەروای دووبارەکردووەتەوە، لە رووی ناوەرۆکەوە نیوەی غەزەلەکەی پەیوەندیی بە غەزەلەکەی مەحوییەوە هەیە، بۆ نموونە:

**نەقیب**

جێی نیاز و ناز و رازی حەزرەتی جانانە شەو
وەقتی نازڵبوونی فەیز و رەحمەتی سوبحانە شەو

**مەحوی**

هەر لە تاریکیی شەوایە رێ درێ ئەهلی نیاز
رازی دڵ ئیفشا بکەن، خەڵوەتگەهی خاسانە شەو

لێکچوونی ئەم دوو غەزەلە یەکجار زۆرە و شوێنی ئەوە نییە باسی هەمووی بکرێت.. (نەقیب) لە قەسیدەیەکیدیکەیدا کاریگەریی قەسیدەی (بەحری نوور)ی لەسەرە و لە رووخسار و ناوەڕۆکدا چاوی لێکردووەتەوە.

(نەقیب) وەکو مەحوی قەسیدەکەی بە (وصلی اللە علی) دەستپێدەکات و تا کۆتایی شوێن پێهەڵگری مەحوییە و هەندێجار

بەیتەکانی مەحویی جویتەوە و هەندێجاریش لە بۆتەی شیعرەکانی تواندوویەتییەوە، بەڵام پێموایە"سابری"سەرکەوتووتر بووە و نەقیب زیاتر چاولێکەربووە، بۆ نموونە:

**نەقیب**

(وصلی الله علی)ذاتێ کە قورئانی پەنا خوانە

لە جوملەی موعجیزاتی ئەوەلی ئایاتی سوبحانە

**مەحوی**

(وصلی الله علی) ئەو حەزرەتی ساحێب کەمالاتە

کە ئەعلا موعجیزەی قوربانی بم من، نووری قورئانە

**نەقیب**

شەهەنشاهی سەریری (لی مع الله) واسیتەی ئیمکان

رەسوولی ئینس و جانە، ئونسی جانە، بەحری ئیحسانە

**مەحوی**

کە وەقتێ ئال و یارانی، لە خدمەتیا دەبن وەك رۆح

حەیاتە، نووری چاوی، ئونسی جانە،مەحضی ئیحسانە

**نەقیب**

لە وەسفی گەورەیی شاهی روسول کول ماوە عەقلی کول

چ سیڕێکە کە فیکری بیکری عاریف تێیا هەراسانە

**مەحوی**

کە هەر سیڕێکی عەقلی کول تیا کول مایەوە (بالکل)

کە هەر سیڕێکی سەد عاریف تیا مەدهۆش و حەیرانە

لە کۆتاییدا دەتوانم بە قەناعەتەوە بڵێم کە مەحوی پێشڕەوایەتیی بزووتنەوەیەکی شیعریی کردووە و لە هەردوو لایەنی شیعری ئایینی و شیعری سۆفیانەدا و جگەلەو شاعیرانەی کە باسمانکردن و هەندێ نموونە لە شیعرەکانیان وەرگیران، کۆمەڵێ شاعیریدیکەش سەر بەو بزووتنەوەیەن و هەریەکە سوارەیەکی لە خەرمانی شیعری مەحوی بەرکەوتووە و خەرمانلۆغەی خۆی وەرگرتووە.

نابێ ئەوەش لە یادبکرێ کە (مەحوی)ش لە شیعری ئایینیدا کاریگەریی (نالی)ی لەسەر بووە و شاگردێکی زیرەك و بە توانای ئەو بووە.

**- لە پاش شیعری ستوونی -عمودی-یەوە ناتوانرێ لای هیچ شاعیرێکی کورد هێڵێکی بەردەوامی سۆفیگەری بەدیبکرێت، تەنانەت وەك هۆکارێکی کارتێکردن و کاریگەریش. بە بۆچوونی ئێوە، ئەگەر ئەوە بە دیاردەیەکی باو بزانن، هۆکاری بناغەیی ئەوە چییە و، تاچ رادەیەك دەتوانرێ ئەوە بە رەنگدانەوەی کاریگەریی مۆدێرنێتە -تازەگەری- بزانرێت و، تاچەند پەیوەندیی بە رووکەشخوازی و رۆنەچوون بە تایبەتمەندییەکانی ئەو جیهانەوە هەیە؟**

+ پێموایە شیعری ستوونی تاکوتەرا تاکۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەم بەردەوامبووبێ و شیعری سۆفیانە لە ئارادابووە، بۆ نموونە لە ناوەڕاستی حەفتاکان (عاسی) وەفاتیکردووە و شیعری سۆفیانەی هەبووە، هەروەها لە ١٩٨٦ (موخلیس) وەفاتیکردووە و شاعیرێکی سۆفی بووە. ئیدی لە نەوەتەکانەوە چرای شیعری سۆفیانە کزبووە و بەرەو کووژانەوە چووە و ئەگەر نووزەیەکیشی مابێ ئەوا بای تازەگەری فوویتێکردووە و هەرچەندە دووریش نییە لەم نوێخوازانە کۆمەڵێ شاعیری سۆفی هەبن، جا بە سلوك سۆفی بن یان شیعری سۆفیانەیان هەبێت، بە هەر حاڵ بڕیار لەسەر بوون و نەبوونی شیعری سۆفیانە قورسە و گرنگ ئەوەیە ڕەواجی جارانی نەماوە.



(١) و (١) ئەوە هەڵەی ئێمەیەیە کە لەو پرسیارەدا لە سێکوچکەی لوتکەی شیعری سۆفیگەریی کوردیدا، لە بری ناوی"مەحوی"نووسرا بوو"نالی"و، بەڕێز دوکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان/ یش بەو شێوەیە وەڵامیداوەتەوە. جەنابی دوکتۆر حەقیەتی و، ئەگەرچی"نالی"زۆر شارەزای زاراوەکانی بواری سۆفیگەرییە و سەرکەوتووانەش لە شیعرەکانیدا بەکاریهێناون، بەڵام هەرگیز سۆفی نەبووە.

(٢) جەنابی دوکتۆر پێی باشنییەساڵی زایینی بەکاربهێنرێ و لەبری ئەوە ساڵی عیسایی بەکاردەهێنێ، بۆیە لە هەرشوێنێکدا وشەی (ع) لە پاش ساڵەکەوە،لە وەڵامەکانی بەڕێزیدا بەکارهێنرابێت مەبەست"عیسایی"یە. ئێمە دەقاودەق وەڵامەکانی بەڕێزیمان وەکو خۆی تایپکردووە، چ لەگەڵ ئەو ڕێنووس و شێوەی بەکارهێنانە بووبێ یان بۆچوونێکیدیکەمان هەبووبێ، مەبەستیش لەو کارە ڕێزنان بووە لە تایبەتمەندییەکانی خۆی.

## شیعری مەحوی
## فێرگەیەك بۆ عیرفان و نیگایەك بۆ ژیان

د. سەباح بەرزنجی (*)

### زنجیرەی یەکەم
### سێ غەزەلی یەکەم لە دیوانی مەحوی:

هەرچەندە بە دڵنیاییەوە مەحوی شیعرەکانی خۆی بەو تەرتیبەی لە دیوانەکەیدا ریزکراوە دانەناوە و نووسینی شیعر جیاوازییەکی جەوهەری لە نووسینیتر هەیە، بەڵام لەو روانگەوە کە دەقی شیعریی خوێندنەوەی جیاجیا و تەنانەت مەنهەجییەتی جیاواز هەڵدەگرێ ویستم لە دەلاقەی سێ غەزەلی یەکەمی دیوانەکەیەوە خوێندنەوەیەك بۆ مەحویی عاریف و مەحویی شاعیر بکەم، لەو دەستپێکەوە کاتێك دەچمە ناو شیعر و دیوانەکەی هەست و بیرکردنەوەم لە کوێدا و لەسەرچی لەنگەردەگرێت و چ ئینتیباعێکم بۆ دروستدەبێت.

سەرەتا دەمەوێت بڵێم کە گەورەترین سەرمایەی مرۆڤ بریتییەلە (خۆی)، خۆی بە هەموو بیر و ئاوەز و هەستونەستیەوە، بە هەموو خولیا و ئارەزوویەکیەوە، بە هەموو بایەخ و بەهایەکیەوە، بەم سەرمایەیە مرۆڤ دەتوانێت مامەڵە لە گەڵ بوون و جیهان و دەوروبەر بکات، سەرەنجام یان بوونی خۆی بەرز و مانادار دەکات یان بە پێچەوانەوە پووچ و کەمبایەخی دەکات، ئەم مامەڵەیە بۆ مرۆڤ سەنگی مەحەکیەتی بۆ هەڵسەنگاندنی رۆڵی خۆی لە ژیانی سەرزەوی، تەعبیر لەم مامەڵەیە زۆر شێوە و شکڵ بە

خۆوەدەگرێت، تاوێك ئەم تەعبیرە لە دەقی فەلسەفی و تاوێك دەقی ئەدەبی و تاوێکیتر لە دەقی هونەریدا نمایشدەکرێت.

فەیلەسووف و شاعیر و هونەرمەند هەرسێکیان لە راستیدا بەو بابەتەوە خەریکن کە باس لە مەوقیعی ئەم مرۆڤە دەکات لە نەخشەی بووندا. لەکوێوە هاتووە و بەرەو کوێ دەچێت وەك حەزرەتی مەولانای رۆمی فەرموویەتی:

ازکجا آمده ام آمدنم بهر چه بود

به کجا میروم آخر ننمائي وطنم

واتە لەکوێوە هاتووم و هاتنم بۆچیبوو؟و بۆکوێ دەڕۆم سەرەنجام؟ ئەمە ئەو پرسیارە دێرینانەن کە بەردەوام زەینی مرۆڤیان سەرقاڵکردووە و وەڵامی جۆراوجۆر دراونەتەوە و لێرەوە بیر و بیردۆزە جیاوازەکان پەیدابوون.

شیعری کوردی لەمبارەوە گەنجینەیەکی گرانبەها و دەریایەکی شەپۆلاوییە و پڕە لە گەوهەری ئەندێشەی بەرز و والآ.. لە شیعری کوردیشدا شیعرەکانی مەحوی هەڵگری خسوسییەتی فەلسەفی و عیرفانی ئەوتۆن کە بۆ هەمیشە مایەی سەرنج و تێڕامانی بیرمەندانی فەلسەفە و عیرفانن.

گوزەرێکی خێرا بە شیعرە بەردەستەکانی مەحویدا ئەو راستییەمان لەلا بەرجەستەدەکات کە ئەو بۆ خۆی سالیك و ڕێبوارێکی بەڵەد و شارەزای ئەم ڕێگەیە و لە خۆیەوە نایەتە ئاخافتن. شیعری ئەو لە

ئەزموونی رووحانییەوە سەرچاوەدەگرێت، ئەزموونێك کە تێکەڵاوی بیری سۆفیزمی کلاسیك و بە تەعبیرێکی وردتر تەزاوجی بیری ئیبن عەرەبی و حەللاج و تەریقەتی نەقشییە. لەم تەزاوجە دنیابینییەکی کراوەی پڕ لە هەست و ئیحساسی شاعیرانە بەرجەستەدەبێت، تێگەیشتن لە دنیابینی مەحوی کارێکی ئاسان نییە، بۆ کەسێك کە بۆ خۆی ئەو دنیایەی ئەزموونەکردبێت و شیعری مەحوی لە راستیدا کۆمەڵێك بازنەی بەیەکداچووی رەنگاوڕەنگە .

ئەو لەهەمانکاتدا کە زانایەکی ئایینی پابەند بە یاساوڕێساکانی شەریعەتە، بڕوایەکی تەواوی بە مەسلەکی عاریفان و تەریقەتی سۆفیزم هەیە و بەتەواوی ڕێز بۆ کەسایەتییە شەتەحییەکانی ئەو مەسلەکە دادەنێت.

شیعرەکانی ئەو زۆربەیان لە قاڵبی غەزەلدان و تەبعی غەزەلیش وەهایە کە تەجسیمی مەحبووبی تێدادەکرێت بە شێوەی ئافرەتێکی جوان و شۆخوشەنگ کە ئەڵبەتە مەبەست لەو بەرجەستەکردنە تەعبیرە لە گونجاندنی عیشقی حەقیقی لە قالبی مەجازدا کە ئەمە بۆ خۆی موجازە و باکێکی لەسەر نییە.

لە یەکەمین غەزەلی دیوانەکەیدا مەحوی ئەم دنیایە بە ( بەحری فیتنە) ناوزەددەکات و ئەو رێگاچارەیە پێشنیاردەکات بۆ خۆی کە پێویستە ( داوێنی باخودا ) بگرێت و لە کەسانی (ناخودا) واتە بێدین قوتاربێ.

لەم بەحری فیتنە بەڵکی نەجاتت بدا خودا
داوێنی باخودا بگرە بەردە نـــــــاخـــــــودا[1]

ناوبردنی دنیا بە بەحری فیتنە، نەریتێکی ئەهلی عیرفان بووە لـە کۆنەوە، لەم روانگەوە رووداوەکانی مێژوو حسابی بـۆتـەی فـیـتـنـە و تاقیکردنەوەی مرۆڤەکانیان بۆ دەکرێ و بۆ دەربازبوون لە شەپـۆلـی ئـەم دەریای فیتنەیە، مرۆڤ پێویستی بە (باخودا) واتە بە ئـەهـلـی خـودا و دۆستانی خودا، پیرانی دەستگیری رێگای تەسەوف هەیە، بەڵام کـێـشـە لەوەدایە کە مرۆڤـ لەم بەحری فیتنەیەدا تەنها و بێکەس بێ و هـاوزمـان و هاوبیری نەبێ، هەربۆیە مەحوی دەڵێت:

بێکەس منم کەسێ لە زوبانم بگا نییە
هەمدەم خودانەناسن و دەم پڕ لە (یاخودا)

لە تەسەوفدا بە هیچ شێوەیەك رێگا بەوە نادرێت کە کەسێك بەبێ ئوستادێکی مورشید رێبکات،چونکە رێگاکە رێگایەکی دژوار و پـر لـە مەترسی و وەسوەسەی شەیتانە (فمن لا شیخ لة فشیخة الشیـطـان)[2]، وەك لە ئەدەبیات و کەلتووری تەسـەوفـدا زۆرجـار جـەخـتی لـەسـەر کراوەتەوە. بوونی شیخ وەك گرەنتییەکی رۆحی و ئەخلاقی وەهـایـە بـۆ بەردەوامبوون لەسەر رێبازی سەلەف، سەلەفیش بریتینلەو زنجیرەی پیرانی تەریقەتە کە دەستاودەست بەرنامە و ئەدەبیاتی تیۆری و کردەیی هێنـاوە و گەیاندووە بەمرۆ. ئەم مانایە بە شێوەیەکی گشتی سۆفـیـیـەکـان لـە

قورئانیان وەرگرتووە کە فرماندەدات بە بڕواداران (یاایها الـذیـن آمـنـوا اتقوا الله و کونوا مع الصادقین )[٣] ، واتە پارێزکاربن و هـاوڕێـیـەتـی ڕاستگۆیان بکەن جگەلەوەی باشتریـن ڕێـگـا بـۆ بـەردەوامـبـوون و پاکژبوونەوەی دڵ و دەروون، بریتییەلە سوحبەتی شێـخ کـە ڕۆڵـێـکـی بنەرەتی هەیە لە پێگەیاندن و پەروەردەی مرۆڤدا.

کێشەکە زیاتر لەوەدایە کە لەم دەوروچەرخی زەمانەدا هەمـیـشـە ئەهلی وەفا نادر و نایابن کە بێگومان سەرسیلسیلەی ئەهلی وەفا پیرانـی مورشیدی تەریقەتن، هەربۆیە بە نەبوونی ئەهلی وەفا، بـەدعـەهـدی و جەفا پەرەدەستینێت:

عـەهد و وەفایە سـوخرەیی بەدعـەهدییو جەفا
هەر ما بە دادی ئەهلی وەفادا بگا خودا
هەر ئەوکەسە کە خەیری دوعای خێری دیوە لێم
دائیم دوعامە شەڕی لە مـن لابدا خودا

مەحوی کە ئەم هەموو بێعەهدی و بێوەفاییە لە دونیا دەبینـێـت، لایەك لە عیشقی مەجازی دەکاتەوە و کەسایەتییەکیدیکە بـە خـۆیـەوە دەبینێت، بۆیە ڕووی نیاز دەکاتە مەحبوبە خەیاڵییەکەی و داوای لوتـفـی لێدەکات، لە کەمبەختی ئەمدا ئەویش بە قارەوە پێیدەڵێت من و تۆ بـۆ یەکتر ناگونجێین و دەبێ لەیەکدووربین :

لوتفێ بە حاڵی من کە، وتم، ئەو وتی بە قار:
تۆ شێخی باخودا و و ئەمن شۆخی ناخودا[٤]

ئینجا دێتەسەر ئەوەی رووی راستەقینەی ئەهلی دنیا نیشانبدات کە تەنانەت ناوی خودا بۆ غەرەزی دنیایی و درۆکردن بەکاردەهێنن:

غەیری ئەمە کە سوێندی درۆی پێبخۆن و بەس
قوربانی ناوی، ناوی لە ناوا نەما خودا

گەورەترین کۆسپ لە رێگای خواناسی و عیشقی حەقیقیدا بریتییەلە دانیان بە بوونی خۆتدا، بوونێك کە ئەگەر بەهەندی وەربگریت دەبیتە حیجاب و مانیعە لە گەیشتن بە (ئەو)، هەربۆیە مەحوی ( مەحو) دەبیت و دەگات بە (خودا)، وەك سێبەرێك کە بە بوونی هەتاو بوونی نامینێت:

تا زوڵمەتی وجودە، تەریکی لە نوری عیشق
سێبەر نەما هەتاوە کە (مەحوی) نەما، خودا

بەڵام خودا لە روانگەی مەحوییەوە چ پەیوەندییەکی بە مرۆڤەوە هەیە، مرۆڤی (ونبوو) لە چۆڵەوانی بووندا کە بوونیش تێکرا بوونی (مەحەببەتە)، پەیوەندییەکە ئەوەیە کە خودا هەم مەقسەدە و هەم رێنما، هەم موژدەدەری وەسڵە و هەم مەنزوری وەسڵ:

بۆ گومبووانی چۆڵی مەحەببەتیەتی، خودا
تەبشیری (والسلام علی تابع الهدی)

موستەغنییە لە مەننی سەفینە و سەفینەوان
هەر کەس کە ئیشی هەر بە خودا بێ نە ناخودا

ئەمە ئەو مەقامەیە کە عاریف دەگاتە قۆناغی ئیستیغنا، تەنانەت لە واسیتەی سەبەبی پیر و ئوستاد بێنیاز دەبێ. ئەو ئونس بە خوداوە دەگرێ و غەیری ئەو بە قابیلی رووتێکردن نازانێت، وەك بڵێیت مەقامی تەجرید و بەرزبوونەوە لە ئاسۆی ئاسایی تێگەیشتنی زۆرینەی بڕواداران، بەڵام ناچارە تەجەسسومی ئەو خۆشەویستە بکات لە شێوەی دولبەرێکدا کە چاوی بیماری هەیە و لەبەرئەو چاوە بیمارە ئەمیش حەزی لە بیماری و دەرد و نەخۆشییە.

دڵ بۆیە خۆشی دێ لە نەخۆشی بە پڕ بە دڵ
بیمارە چاوی یار و خۆشی دێ لە دەرد و دا

بەڵام دڵ لە نیگای مەحوییەوە کاتێك دڵە کە سۆزی ئەوینی خودای تیابێت، ئەگینا بە دڵی خاڵیی لەو سۆز و ئەوینە، هاواری پەیتاپەیتای (یاخودا)کردن تەنهاوتەنها دووبارەکردنەوەی وشەیە و هیچیتر:

بە خودا قەسەم لەگەڵ دڵی خاڵیی لە سۆزی عیشق
تەکراری حەرفە بەس دەمی پڕ یاخودا خودا

مەحوی لە رووی ئیعتیراف بە بچووکی و نادیدەبوونی دڵی خۆیەوە پێیوایە، تەخەییولی جەلالی خودا بە دڵ وەك جێکردنەوەی ئاسمان وایە لە دانە کونجییەکدا:

گونجایشی جەلالی خەیاڵی ئەوم لە دڵ

جێبوونەوەی سەمایە لە یەك دانە کونجودا

کێشەی مەحوی لە دیوانەکەیدا کێشەی مرۆڤە لە فرەیی ئیهتیمام و پەرتبوونی خەیاڵ و ئەندێشەدا، ئەو کە لە هەندێك لە بەیتەکانیدا بۆنی یەکیەتی بوونی لیدەکرێ لە زۆر شوێندا بەپێچەوانەوە دان بە دوالیزمەی عاشق و مەعشووقدا دەنێ، وەك ئەوەی نەیەوێ سیمای بیرمەندێکی فەیلەسوف و خاوەن بنەمای نەگۆڕ بەخۆیەوە بگرێ و ئەنقەست دەیەوێ شاعیرانە و عاریفانە لە کەرتگەلی حالاتی رۆحی خۆی گوزارشتبکات، هەربۆیە پەردەیەکی نوێ دادەداتەوە و دەڵێ:

لەورۆژەوە جودا بووە لێم ئەو پەریی وەشە

رۆژم رەشە، شوعور و دڵم لێبووە جودا

ئەمە لە عەینی حالدا کە جۆرێك لە یەکبوون لەنێوان خۆی و خۆشەویستدا نمایشدەکا، تەوسیفی ئەوەشمان بۆ دەکات کە جۆرێك پەرتبوون لە کەسایەتی مەحویدا هەیە کە بەو شێوەیە جەوەلاندەکات لەنێوان یەکبوون و فرەبووندا (الوحدة و الكثرة).

ئەو بڕوای تەواوی بەوە هەیە کە عیشق ڕەنج و مەینەتییەکی زۆری پێوەیە و ڕێگایەکی گولفەرشکراو نییە و عاشق هەمیشە وا لە بۆتەی ئەزموون و تاقیکردنەوەدا و کۆسپی فرە و ترسناکی لە بەردەمدایە:

بەس کاری دڵ توێنەوە (مەحوی) لە پێشتە
(لایحسب الأناسي أن یترکوا سدی)

عیشق لە تەرازووی هۆش و ژیریدا جۆرێکە لە (جنون)، ئەمیش بۆ خۆی مەنهەج و (ئادابی) تایبەتیی هەیە، جودا لەو ئاداب و تەرتیبەی لە بەرنامە و مەنهەجی (عاقڵاندا) هەیە، مەحوی لەمبارەوە دەفەرموێ:

بەجێ نایێ ، دەبێ رووکەینە سارا
حەقی ئادابی مەجنوونی لە شارا

دەیەوێ بڵێت، عیشق، پێویستی بە جۆرێك لە ئاوارەیی و عوزلەت و دوورکەتنەوەیە لە (غەیر)، لە شلۆقی کۆمەڵایەتی.

مەحوی هەمیشە ویستوویەتی لە دەرفەت ئەو سوودە وەربگرێت کە نابێت دڵ ببەستین بە دنیاوە، چونکە دنیا هیچ وەفا و حورمەتێکی بۆ ئەهلی خۆی نییە، بەڵکو بە دنیادارە گەورەکان یاریدەکات:

کە چەرخ ئەسکەندەری دی دەردەدارە
وتی: ئەم هەم بووە هەمدەردی دارا

چونکە پێشمەرجی سلوکی عیرفانی بریتییەلە وازهێنان لە دنیا و فریودانەکانی یا ویستنی دنیا یا ویستنی حەق. خیارێکی سێیەم لەم سەروبەندەدا بوونی نییە، دیارە ئەمەش بڕیارێکی کۆتایی دەوێ، مەحوی ئەم بڕیارەی هەر زووداوە کە هەمیشە نەزەری لە خودابێ و لەمپێناوەدا لە چوونە سەردار باك و ترسی نەبێت:

هەتا حەق ناسیرە، هەر حەقمە مەنزور
وەکو مەنسور ئەگەر بمکەن بە دارا

مەنسور لە روانگەی مەحوییەوە سمبولی ساغبوونەوەیە بۆ حەق، هەرچەندە مەرج نییە، بە هەموو وردەکارییەکانی وەحدەتی وجوودی حەللاج قایلبووبێت، وەك لە بەیتێکدا گوتوویەتی:

با حەقیشی بێ، لە بۆ مەنسور (انا الحق) حەق نییە
شێتییە مەجنون ئەگەر بێ نازی لەیلایی بکا

ژیان لە کۆی ماناکەیدا هەوڵوتەقالای مرۆڤە بۆ گەیشتن بە دۆست، ئەمە لە جیهانبینی مەحویدا نابێتە هۆی نائومێدبوون، هەربۆیە بەوپەڕی سەراحەتەوە دەڵێ:

نەگەیمە ئەو جوانە و گەیمە پیری
مەدەد یا پیری پیرانی بوخارا

مەددەدخواستن بۆ خۆی نەریتێکی جێگیری ئەهلی عیرفانە و لە دیدی ئەواندا هیچ ناتەباییەکی لەگەڵ بنەمای تەوحید نییە، چونکە خۆشویستنی شێخ لە قامووسی ئەهلی عیرفاندا فەرعی خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرە(د.خ).

ئەم جیهانە جیهانی خۆبەکەمزانین و توانەوەیە لە خۆشەویستیی (ئەو)دا، هەنگاوێك بەرەو (فەنا)بوون لەپێناوی( بەقا):

لەبەر زار و نەزاریی بوومە وەك پووش
دە ئەمجا رامبوێرە من بە زارا

تا دەگاتە ئەو ئاستەی پەنادەباتە بەر قەلەم بۆ ئەوەی عەرزی حاڵی ئەم بکات لای یار، چونکە خۆی توانای رووبەڕووبوونەوەی نییە:

مەگەر تۆ عەرزی حاڵم کەی لە کن یار
قەڵەم، ساغی قسە: من نیمە یارا

لای سۆفییان بەتایبەت لای مەحوی (زاهید) سمبولی ئەو کەسانەیە کە بە رواڵەت دینداریدەکەن و وشك و دۆگما و دوورن لە سۆزی ئەوینی راستەقینە، زوهدی ریایی لە کۆنەوە مایەی تانەوتوانجی ئەدەبیاتی سۆفیانە بووە، نەك لەبەرئەوەی زوهد لە خودی خۆیدا خراپبێت، بەڵکو لەبەرئەوەی زوهدی رواڵەتی و درۆینە جۆرێکە لە نیفاق و دووڕوویی، کۆنابێتەوە لەگەڵ عیشق کە لە مانادا ساغبوونەوەی مرۆڤە بۆ

(مەحبووب). زاهید تەنها لە دووی مەسڵەحەت دەگەڕێت و ئامادە نییە بۆ هیچ خۆبەخشی و گیانفیدایییەك.

هەربۆیە مەحوی زۆر بە توانجەوە پلاردەگرێتە ( زاهید)و دەیهێنێتە نزمترین ئاست کە ئاستی (ئاژەڵە) کاتێك دەڵێت:

لەڕم دی زاهید ئەم زستانە, زانیم
کللك نادا بە زڕینگی[٥] بەهارا

مەحوی کە دەیەوێت گوزارشت لە بیر و هزری خۆی بدات لە شێوەی دەربڕیندا هونەرنمایی و پەردەدارییەکی جوان دەکات، لە هەموو غەزەلەکانیدا ئەمە بووەتە خەسڵەتێکی هەمیشەیی بۆ نموونە هەر لەم سەروبەندەدا پەردەی زوهدی ریایی لادەدات و روودەکاتە مەحبوبەکەی:

وەرە دەستێ بە خوونم کە نیگارین
خوێنی من حەڵاڵت بێ، نیگارا

کەسی ئەویندار دەبێ بەو شێوەیە لە ئیختیاری ئەوینەکەیدا بێت و پێشوەخت خوێنی خۆی بۆ حەڵاڵبکات، وەك بڵێت دەگاتە قۆناغێك کە لە بوونی خۆی دەستدەشوات و ئامادەی تیاچوون و فەنابوونە لەپێناوی مەحبووبدا.

ئەوەی لای ئەویندار سەختە و لە فەرهەنگی عیرفاندا روبەرێکی شایانی بۆ تەرخانکراوە، مەسەلەی روووەڕچەرخانی مەحبوبە لە ئەویندار، جۆرە حیجابێك لەنێواندا پەیدادەبێت کە ئەوەندەیتر تاسە و سۆز لە ناخی ئەودا تیندەستێنێت. رەنگە گەورەترین عەزابیش بۆ مرۆڤ

ئەوەیە کە (ئەو) رووبەرووبوونەوەی ناکات، هەربۆیە گەورەترین پاداشتیش ئەوەیە کە رووبەرووی ببێتەوە و نەوازشی بکات، لە قورئانی پیرۆزدا کاتێك باس لە سزای ئەو کەسانە دەکات کە بڕوایان نییە بە رۆژی دوایی کە رۆژی پاداشت و سزایە، پاداشتی یاران بە وەسڵ و سزای نەیاران بە فەسڵ دەفەرموێ: (كلا انهم عن ربهم يومئذٍ لمحجوبون)[٦] ، ئەو راستییەمان بۆ بەرجەستەدەبێت کە ئەوپەڕی نیاز و ئامانجی رێبوارێکی ئەم رێگایە گەیشتنە بەو دیدارە شیرین و سازگارە کە لە سەرووی هەموو خواستێکەوەیە.

زوو ئەو شۆخە لە عاشق وەردەچەرخێ
لەگەڵ کەس، چەرخە ئەو، ناکا مودارا

جاروبارێك دەبێ ئەویندار ئەو هەستەی بۆ دروست دببێ کە یار رووبەرووی ناکات، وەك ئەوەی یار بێباکە لە عاشق و فەرامۆشیدەکات.

ئەو پەیوەندییەی لەنێوان خالق و مەخلوق، عاشق و مەعشوق، دولبەر و دڵدار، هەیە لە نەزەری ئەهلی عیرفاندا بریتییەلە بزاڤی سالیك لەنێوان خەوف و رەجادا، خەوف واتە ترس لە قەهر و رەجاش واتە ئومێد بە لوتف و مەرحەمەتی (ئەو).. بۆیە کاتێك مەحوی دەفەرموی:

موژەی خوێنێ دەکا هەر لەحزە، سەیرە
ئەمەندە گوڵ لە بن یەك نووکە خارا

لە حەقیقەتدا وێنای ئەو حاڵەتی خەوفەمان بۆ دەکات کە عاریف لە هەندێك لە ساتەکانی سلوکدا هەستیانپێدەکات مەبادا گرفتاری قەهری خودا بووبێ.

بەس لە هەر ئان و ساتێکدا دنیا لەبەرچاوی سالیك شتێکی نەویستراو و بێزراوە و بۆئەم مەبەستەش هەموو ئوسلوبێك بەکاردەهێنێت تا لەبەرچاوی خۆیدا زشت و ناشیرینیبکات، هەربۆیە جێی خۆیەتی مەحوی غەزەلی سییەمی بەم بەیتە دابخات:

کە شك بەم ( مەحوییا) هەر شەربەتی مەرگ
لەسەر ئەرزا نییە ئاوی گەوارا

مەرگ تێکدەری هەموو خۆشییەکی ماددی ئەم دنیایەیە، کەواتە هیچ خۆشی و ئارەزوویەکی دنیایی ئەوە ناهێنێت کە مرۆڤ دڵی پێببەستێت و پێوەی پابەندبێت، وەك ئەوەی ئەهلی (غەفڵەت) ئالوودە و گرفتاری بوون. تەعبیری شەربەتی مەرگ وەرگرتن و ئیقتیباسێکی سەرکەوتووی مەحوییە لە ئایەتی (كل نفس ذائقة الموت ثم الينا ترجعون)[٧].

بێگومان مەرگ لە تەسەوری ئەودا تاموچێژی شەربەتی هەیە لەو رووەوە کە پردێکە بۆ گەیشتن بەو، مەرگ گواستنەوەی رۆحە لە مەنزڵێکەوە بۆ مەنزڵێکیتر. کەسێك بەمشێوەیە لە مرۆڤ و لە دنیا و لە ژیان ومەرگ بڕوانێت، بێگومان پێناسەیەکی تایبەتی هەیە بۆ (خود)و بۆ تەکامولی (خود)و لەویشەوە بۆ (خودا)و بۆ بوون بە مانا کراوە و

فراوانەکەی، لەو پێناسەوە دەیەوێت فەزایەك و پانتاییەك بۆ ئاسوودەیی رۆح بدۆزێتەوە و پێشنیازبکات، فەزایەك لە ئولفەت و خووگرتن بە جوانییەکانی بوون و ژیان کە بەتەواوی لەو پیاهەڵدان و وەسفکردنی مەحبووبی مەجازییەدا خۆی دەبینێت کە ئەم شەووڕۆژ بۆی دەسووتێت و دەتوێتەوە تائەو ئاستەی کە (مەحو) دەبێت.

مەرج نییە لە هیچ دەقێکی شیعری کلاسیکدا ئەو پەیوەستبوونە لەنێوان بەیتەکاندا هەبێ و دەگونجێت هەر بەیتێك لە دۆخێکی جیاواز و هەلومەرجی تایبەتدا هۆنرابێتەوە و تەنها لە سیاقی کێش و سەروادا یەکبگرنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەربەستێك نییە بۆئەوەی بە روانگەیەکی گشتگیر لە کۆی تێکستەکانی یەك شاعیری وەك مەحویی بڕوانین کە بۆ خۆی لەسەر زەمینەی بیر و فەلسەفەیەکی عیرفانیی پێناسەکراو گۆشەنیگای خۆی لەمەڕ کۆی گوتەزاکانی ژیان و جیهان و بوون و گەردوون تۆماردەکات.

ئەو لە جیهاندا جوانییەکی هەماهەنگ دەبینێت کە زوهدی ریایی و نیفاق و دووڕوویی مرۆڤەکان خەوشی لەسەر دروستدەکات و بۆ پالفتە و پاککردنەوەی ئەو خەوشە کار لەسەر مرۆڤ و ناوەوەی مرۆڤ دەکات بەوەی بیبەستێت بە مەحبوبێکەوە کە هەموو نازوعیشوە وغەمزە و تەننازییە، کە هەموو سەرسامکردن و دڵڕووباییە، ئەم مەحبوبەی مەحوی شکڵێکی جێگیر و نەگۆڕی نییە، تاوێ ئافرەتێکی جوانی بەلەش و لاری شۆخوشەنگە و تاوێکیش پیرێکی مورادی دەستگیر و دواتریش خودایەکی خۆشەویست و مرۆڤنەوازی وەهایە کە سەرچاوەی هەموو فەیز و نور و ئامانجی هەموو رازونیاز و سۆزوگودازێکە.

ئەمن بەوشێوەیە لە مەحویی حاڵی بووم کە زاراوەکانی عیرفانی لە ناواخنی غەزەل و قەسیدەکانیدا بۆ ئەوە بەکاردەهێنێت کە باس لە دڵ و دەروونی پڕ لە کوڵ و تینی ئەوینێکی نەبڕاوە بکات کە بە سەد شێوە و ڕەنگ و دەنگ خۆی نمایشدەکات و هەر تاوێك بە جۆرێك پاڵپێوەدەنێت.

ئەو لەهەمانکاتدا تەقەمموسی هەموو عاشقە گەورەکانی ناو کەلتوری تەسەوف دەکات و بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەوان لە خۆیدا بەرجەستەدەکات، هەر لە حەللاج و ئیبن عەرەبی و بایەزیدەوە بگرە تا مەولانای رۆم و مەولانا خالید و بەو شێوەیە دەیەوێ پێمانبڵێت ئەمانە هەموویان هەڵوەدای یەك راستی و یەك جەوهەر و یەك حەقیقەت بوون.. هەرهەموویان بە تەعبیر و زمانی جیاواز باسیان لە وەحدەتێك کردووە کە بە شیوەگەلی فرە و فراوان دەرکەوتووە.



**پەراوێزەکان:**

[1]. بەکارهێنانی وشەی ( ناخودا) بە قەرینەی وشەی ( بەحر) لە بەیتەکەدا ئیهامی تێدایە، مانایەکی نزیکی هەیە کە بریتییەلە کەشتیوان کە مەبەست نیە و مانایەکی دووریشی هەیە کە بریتییەلە بێبڕوا کە دیارە مەبەستی شاعیر بووە.
[2]. ئەم وتەیە لە ناو ئەهلی تەسەوفدا زۆر بەربلاوە، هەندێکیش بە فەرموودەی دەزانن ، بەڵام فەرموودە نییە، هەرچەند ماناکەی راست و دروستە..
٣. التوبە / ١١٩
٤. تۆ شێخی باخودا وو ئەمن شۆخی ناخودا: واتە تۆ شێخی روو لە خوا و منیش شۆخی بێبڕوا بە خودا، هەندێکجار شاعیر کە بێمیهری و جەفای دولبەرەکەی دەبینێت، لە رووی مەجازەوە دولبەر بە کافر و بێدین ناوزەد دەکات وەکو شێخ رەزا دەڵێ: جاری نەبوو ئەو کافرە شەرمێ لە خوداکا..
٥. زرِپِنگ : واتە گیای زووڕەس .
٦. المطففین /١٥
٧. العنکبوت / ٥٧.

## مەحـوی بــە مەحـوی
## لێکدانەوەی بەیتێکی "مەحوی" بە شـیعری خۆی
## ع . باخانی

لە بەیتێکی ناسکیدا کە لە لێکدانەوەی "دیـوانـی مـەحـوی"، تارادەیەکی بەرچاو، بایەخی نەدراوەتێ و سەرپێیی لێکدراوەتەوە، شاعـیر دەڵێ:

دەنگی پێی ئەحبـابی رۆیوو پـڕ بە عالەم مەوجەدا
تۆ، بە غـەفڵەت موبتـەلا، گەر نەیبیـەی مەستی خەوی

**غەزەلی ١٢ ی ٣١٨**

ئاسان نییە بەسەر بەیتی ئاوەهادا بازبدرێ کە دیـوانـی شـاعـیر پاڵپشت و پشتیوانی زۆری تێدابەدیدەکرێت هـەم بـۆ روونـکـردنـەوەی بەیتەکە و هەم بۆ تایبەتمەندییەکانی ئەو زاراوە تایبەتانەی لەم بـەیـتـەدا بەکارهێنراون. لە یەکەمین وشەوە "دەنگ" شاعـیر رووبـەڕووی شـتـی نائاساییمان دەکاتەوە، چونکە ئەو دەنگە تەنها رەنگدانەوەی ناخە، واتـە وێناکردن –تصور–ە و لەڕووی واقیعەوە هیچ بنەمایەکی راستەقینەی بـۆ نادیترێتەوە. هۆی ئەم تێگەیشتنە ئەگەرەکانی لێکدانەوەی "ئـەحـبـابـی رۆیوو– خۆشەویستە کۆچکردووەکان"ە.

با لە یەکەمین هەنگاودا ئەگەرەکانی لێکدانەوەی "کـۆچـکـردوو" بخەینەڕوو.. بە هەموو پێوەرێك ئەو وشە لێکدراوە تەنها یەکێك لـە دوو لێکدانەوە هەڵدەگرێت: "رۆیوو–رۆیشتوو– کۆچکردوو"

١. ئەوەی بە هەر هۆیەك بووبێت شوێنێك بەجێبهێڵێت و روو لـە شوێنێکیدیکە بکات.

٢. ئەوەی ماڵئاوایی لە ژیان بکات. دەتـوانـرێ سـەرنجـی ئـەو راستییە بدرێت کە "دەنگی پێ" بۆ خۆشەویستانی کۆچکردوو، ئەگەر بە یەکەمین مەعنابێت ئەوا تەنها بۆ ماوەی بیست، سی مەتری راستەوخۆی پاش ماڵئاوایی لەیەککردن دەتوانرێ ببیسترێ دەتوانرێ ببیـسـترێـت و، لەوە بەدواوە هەستکردن بە هەر شتێك دەبێتە رەنگدانەوەی هـەڵچـوونـی ناخی ئەو کەسەی ناتوانێ بـە ئـاسـانـی لـەگـەڵ ئـەو جـودایـی و لێکدوورکەوتنەوەیە خۆی رابهێنێت و لەو حاڵەتەشـدا، بـەپـێـی رادەی خۆشەویستیی نێوانیان نەك تەنها دەنـگـی پـێـی خـۆشـەویسـت – خۆشەویستان، بەڵکو هەموو شتێکیدیکەش هەر بە شێوەیەکی زەق لـە یادەوەریی عاشقدا بوونی بەرجەستەی خۆی هەیە و ناخی ئـەو دەخـاتـە حاڵەتی نائارامی و شڵەژانی توندی دەروون، مەحوی دەڵێ:

بـە ئۆغرکردنـی من بوومە قەقنەس

کە ئەو چوو بۆ سەفەر، من بۆ سەقەر چووم

**٧ م ٦، ٢٢٦**

خۆ ئەگەر بە دووەمین مەعناش بێت ئەوا کۆچکردوو – مردوو – ناتوانێ بڕوات و ئەوەی نەڕوات ناتوانرێ باسی "دەنگی پێ"ی بکرێت، بەڵام دیارە ڕەنگدانەوەی ناخی عاشق – نائارامی و شڵەژانی – زۆر لەوەی حاڵەتی پێشوو زیاتر و سەختتر دەبێت، چونکە لەم حاڵەتەدا عاشق دڵنیادەبێت لەوەی دووری و جوداییەکە ڕاستەقینە و زەقترە و ئیدی لە هەموو ژیاندا، ئەگەر بە خەون نەبێت، ناتوانی جارێکیدیکە بە دیداری خۆشەویستەکەی شادببێتەوە. سەختیی ئەزموونی خۆشەویستیی سۆفییگەرانەش لێرەدایە.. ئەو خۆشەویستییەی حاڵەتی مەجنوونی کردووەتە ڕووپۆشێکی گونجاوی خۆی، مەحوی دەڵێ:

شەوێ لەیلا بە مەجنوونی وەها وادەی تەماشادا:
دەبێ ڕۆژێ ببینی من، کە تۆ ڕێ خەیە دەشتی خەو
٤ و ٤، ٢٦١

بەڵام تەنها شتی نائاسایی لەو بەیتەی شاعیردا باسکردنی "دەنگی پێی ئەحبابی ڕۆیوو" نییە، بەڵکو تەعبیرکردن لەو دەنگە بە "پڕ بە عالەم مەوج ئەدا" پتر خوێنەر سەرسامدەکات، چونکە لەلایەکەوە سنوور بۆ ئەو دەنگە دانەنراوە: "پڕ بە عالەم"، واتە هەموو جیهانی گرتووەتەوە و لەلایەکیدیکەشەوە گوتوویەتی"مەوج ئەدا– شەپۆلاندەدا". نائاساییبوونی تەعبیرکردن بە"مەوجئەدا" بۆ دەنگ لەوەدایە ئەرکی دوو ئەندامی جیاوازی جەستەی بەرپرس لە دوو هەستی جیاوازی بۆ یەك مەبەست خستووەتەگەڕ: بە"گوێ" هەست بە "دەنگ"

دەکرێت و بە "چاو" شەپۆل دەبینرێت، کەچی شاعیر گوتوویەتی: "دەنگی پێی ئەحبابی رۆیوو پڕ بە عالەم مەوجئەدا"، کۆکردنەوەی ئەم دوو شتە جیاوازە لە یەك بۆتەدا چیدەگەیەنێت؟.

ونکردنی خود یان بە تەعبیری "مەحوی" خۆی، "خۆ لە خۆ غایبببوون" دەکرێ ببێتە دەروازەیەکی گونجاوی ئەم جیهانەوە. بە لای شاعیرەوە نەك تەنها ئەو چرکەیەی کە یار تێیدا بارێبەستووە و کۆچدەکات، بەڵکو هەموو کاتێکی لەبەر چاو ونبوونی ئەو مایەی بێئاگایی ئەمە:

کە تۆ غایب لەبەر چاوم دەبی، چم بێ لە تۆ غایب
قیامت حاضری بەرچاومە، خۆمم لە خۆ غایب

**٥ ب ١، ٥١**

ئەمە لایەنێکی مەنتیقی تایبەتی ئەزموونەکەیە و سەرلەبەری ئەو ئەزموونەش –سۆفییگەری– لە هاوکێشەیەکی ئێجگار سەختدا چڕدەبێتەوە: "عاشق ناتوانێ لەم رووبەرەدا کە پێیدەگوترێ" ژیان لەم دنیایەدا " بەدیداری یار شادببێت". ئەمە هەمان ئەو مەنتیقەیە کە لەسەر زاری "لەیلا " بە "مەجنوون" راگەیەندرا: " دەبێ رۆژێ ببینی من کە تۆ رێ خەیتە دەشتی خەو". بەمەش، نەك تەنها بە بزربوون – غائیب بوون –، بەڵکو بە هاتنی یاریش هەر دەبێ عاشق لە خۆ بڕوا:

کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ دەکـەی ئەو ڕۆژە تۆ بـڕوا

کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر، دڵ، وەکو شـەونم لە خۆ بڕوا

**١٣ أ ١، ٣٥**

وتی "مەحوی" من و تـۆ ئافتاب و سایە تیمثـالین

جەنابی من کە دەرکەوتم، دەبێ تەشریفی تۆ بڕوا

**١٢ أ ٥، ٣٦**

دەپرسی: بۆچی من دەرکەوتم و دڵ بـوو لە تۆ غایب

کە وەختێ ڕۆژهەلات، ئەڵبەت دەبێ شەونم لە خۆ غایب

**٦ ب ١، ٥٣**

ئەم مەنتیقە هەمان مەنتیقە کە ئەزموونی عیشق تـەنـهـا یـەك لایەنی پایەداری هەیە ئەویش یار -مەعشووق-ە و لەوە بەولاوە هەمـوو بوونەوەرێکیدیکە لە بوونی و لە هەموو شتێکیدیکەیدا پێویستی بـەوە، بۆیە دەبێ لە خاڵە بنەڕەتییەکاندا – کە خۆشەویستـی زۆر تـێـیـانـدا بەرچاوە – بە تەواوی پشتگوێبخرێت.. بۆ ڕەنگدانەوەی ئەم قـەنـاعـەتـە لای مەحوی، بڕوانە:

بلاّ ڕۆحت موقەددەس بێ، ئەم و ئەو کردنت بـەس بێ

هەتا ئاخر هەناسە ئەو بناسە، هەر بنازە بـەو

**٤ و ٣، ٢٦١**

لەسەر تۆ بوومە پەندی عالەمێ، وتم و، وتی "مەحوی"
بەسی بێ موشریکی، بـەس، یا لە دنیا یا لە من لادە

**٣ ﻫ ٦، ٢٦٩**

ئەزموونێکی خۆشەویستی ئا ئەمانە پێوەرە بەرچـاوەکـانـی بـن، بێگومان رواڵەتەکانیش هەر دەچنە ژێر رکـێـفـی ئـەو پـێـوەرانـەوە، رواڵەتەکانی خۆشەویستیی ئاساییش چەمکە بناغەییەکانـی: "خـۆشـی، کامەرانی، خۆشکامی، دڵنیایی، بەیەکگەیشتن و بـەدیـدارشـادبـوون"ن، لەڕووی کامڕانییەوە و "دڵتەنگی، ناشادی، بەدکامی، دوودڵی، دووری، جودایی و جیابوونەوە"ن، لەڕووی ناکامییەوە، بـەڵام چـەمـکـە هـەرە بناغەییەکانی عیشقی حەقیقی – ئەزموونی سۆفییگەری جیاوازن:

ئوصوولی دینی عیشـقە سووتن و بەس
پەڕی پەروانەمە ( جمع الجوامع )
لوغاتـی ئێمە ناڵـە و ئاهە ( قطعاً )
لوغەی وا ناگرێ ( بُرهان قاطع )

**٢ ع ٦ و ٧، ١٦٨**

لەو دوو بەیتەدا بنەما "پرنسیپ – اصول"ەکانی ڕێبازی عیـشـق خراونەتەڕوو، کە بە "دینی عیشق" ناوبراوە و بەتەنها سووتان "سووتن و بەس" دەستنیشانکراوە و چەمکەکان یان وشەکانی – شاعیر "لوغـە"ی بۆ بەکا هێناوە – عاشقانیش تەنها ئاه و ناڵەیە. ئـەمـەش بـنـاغـەی

جیاوازیی فەرهەنگی زمانی عیشقە، چونکە فەرهەنگی "بُرهان قاطع"، سەرەڕای ئەوەی بەناوبانگترین فەرهەنگی زمانی فارسیی ئەوکاتەی شاعیر بووە و زمانی فارسیش زمانی هەرە پێشکەوتووی ئەدەب بووە، بە ئەدەبی سۆفییگەریشەوە، بەلاّم چونکە فەرهەنگی زمانی ئاسایی بووە ئەوا چەمکە تایبەتەکانی "ناڵە" و "ئاه"ی عیشقی حەقیقیی بەخۆوەنەگرتووە، چونکە بەپێی بنەما تایبەتەکانی عیشق لێکینەداونەتەوە.

لێرەوە، لە ڕەچاوکردنی ئەم تایبەتمەندێتییەی ئەم ئەزموونەوە، "مەحوی" ڕووی دەمی لە خۆی دەکات کە سنووری خۆی رابگرێت و نەیبەزێنێ و بزانێ کێ "ئاشنا"و "مەحرەمیراز"و کێ "غەیر"و " نامەحرەم"ە و هەوڵنەدات خاڵی پڕ دوڕڕ و یاقووتی ژیانبەخشی دەریای عیشق بۆ ئەو نامەحرەمانە باسنەکات کە لە بناغەوە لە بەخششی بێگیانی دنیا دەگەڕێن:

لە بۆ ئەربابی دنیا قەت مەدە بەسگ و بەیانی عیشق
کە " مەحوی " شەرحی نوکتەی جانفزا بۆ مردووە ضایع
**١ ع ٧، ١٦٦**

لە بەرانبەریشدا پێویستناکا بۆ "یار" و "ئاشنا"و ڕێبوارانی هەمان ڕێگە "هاوڕازان" باسی هیچ شتێك بکرێت، چونکە:

دەردەدار ئەڵبەت زوبانی دەردو حەسرەت تێ دەگا
چاوی بیمارە دەزانــێ نالــە نالــم بۆچیــە !
**١٤ هـ ٩، ٢٩٤**

ئەمە سەرەتاکانی ئەو ئەزموونە و مەنتیقی تایبەتێتی و بــەوەش رێبوارانی ئەو رێگەیە لە رێبوارانی رێگەکانیدیکە جیادەکرێنەوە و هــەر ئەو مەنتیقەش باس لە دوولایەنیی ( کامڕانی و ناکامی )، ( شــادی و ناشادی )، ( بزە و فرمێسك ) بەوشێوەیە ناکــات کــە ئــەوانــیــدیــکــە باسیدەکەن، بەڵکو:

خۆشە بە یــادی ئەو لەبەوە نۆشی خوێی دڵ
بەم نەشئە ئاشــنا نەبووە غەیــری ئەهلــی ژەوق
**٣ ق ٢، ١٨٣**

شێرێکی پێ لە سیلسیلەیە ئەسیری عیشــق
مەردی، بزانــە زینەتی مەردانە تەوق و رەوق
**٣ ق ٦، ١٨٤**

کە کــوژرا، شاهی عالی جاهی عیشە
هەتا صەیدت نەکەن ناگەیتە فیتراك
**١ ك ٤، ١٨٦**

لەم دوا بەیتەدا رەنگە پێویستبێت ئاماژە بەو خاڵە بکرێت کە وشەی "فیتراك"، وەکو مامۆستایانی لێکدەرەوەی "دیوانی مەحوی" روونیانکردووەتەوە: "تیلمە چەرمێکی باریکە بەدوای زینی ئەسپیەوەی دەدەکەن، بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکیان خستە پاشکۆوە پێیببەستنەوە — پەراوێزی ژمارە ٤ ی لاپەڕە ١٨٦ "، هۆی شانازیکردنی عاشق بەو چارەنووسە لەوەدایە کە بەڵگەی قایلبوونی مەعشووقە ئەم ببێتە عاشقی و دەست لە هەموو شتێکیش لەپێناوی ئەودا هەڵبگرێت و بەوەش ببێتە یەکێك لە پاشکۆ — شوێنکەوتوو -ەکانی یار.

لەم بەیتەدا گواستنەوەیەك لە سێیەمین کەسی تاکەوە "ئەو" — لە یەکەمین بەشیدا — بۆ دووەمین کەسی تاك "تۆ" — لە دووەمین بەشیدا — بەدیدەکرێت. هەروەها لەم بەیتەدا جۆرە پلەوپایەیەکی نائاسایی بەرزی عاشق بەدیدەکرێت، بەلاّم عیشق، هەر لای "مەحوی" گۆڕەپانێکی کراوەیە بۆ بەرزبوونەوەی زیاتر لە پلەوپایە، لە هەمانجۆر:

روتبەی کەماڵە رۆژەڕەشی بۆ جگەر بە خوون
ناکامە تا کە رەش نەبووە خوونی خامی میسك

**٢ ك ٢، ١٨٨**

وەکو لەم بەیتەدا بەدیدەکرێ، شاعیر وشەی "رەش"ی لە "رۆژەڕەش" و "رەش نەبووە"ی کردووەتە بەڵگە لە بواری پەڕینەوە لە زمان و مەنتیقی ئەزموونی عیشقی سۆفییگەرانەوە بۆ زمان و مەنتیقی ژیانی ئاسایی — جیهانی فیزیکی —ی خەڵکە ئاساییەکە، واتە پاساوی

بۆ بوونی "ڕۆژەڕەشی" بە پلەوپایەی کامڵبوون لە عیشقی سۆفییگەرانەدا، بەو بەڵگەیە هێناوەتەوە کە تا خوێنی خاوی جۆرە ئاسکێکی تایبەتی ڕەش نەبێت نابێتە ئەو "میسك"ە بۆنخۆش و نایابەی بە ئاسانی چنگناکەوێ. بەڵگەکە هی ئەم جیهانەیە و هەموو کەسێکی ئاسایی شارەزا لە چییەتیی "میسك" دەزانێ کە میسك لەو شوێنە ناوکئاسایەی ئەوجۆرە ئاسکەوە وەردەگیرێت، بەڵام تەنها ئەو جۆرە عاشقانە "ڕۆژەڕەشی" بە "پلەوپایەی کامڵ بوون " دەزانن کە بە کردەوە لەو ئەزموونەدا دەژین .

ئەمجۆرە پاساو و بەڵگەهێنانەوە و ئەنجامگیرییە، بە ئامێتەکردنی ڕاستییە بەتەواوی جیاوازەکانی ئەو دوو جیهانە، بۆ هەمانمەبەست، لە شیعریدیکەی شاعیردا بەدیدەکرێ، بۆ نموونە:

لە دەورمدا حەصار: ئافەت، لەسەر سەر خەیمە دوودی ئاه
لە سایەی عیشقەوە بوومە شەهی صاحیب سەراپەردە
**٤ ه ٦،، ٢٧١**

شوکر یار ئیژنی دام هەم گریە کەم هەم قوڕ بەسەردا کەم
بە جاریێ شاهی من بەحر و بەڕی بەخشی بە دەروێشێ
**٥ ی ٣، ٣٠٣**

لە هەموو ئەم نموونە سەرکەوتووانەدا، ئەگەرچی جوانی و تۆکمەیی داڕشتن و وێنە سەرنجڕاکێشەکان بە ئاسانی بوار بە پەیبردن بە ئامادەبوونی دراو - Data- کانی هەردوو جیهانە جیاوازەکەی ئەزموونی سۆفییگەری و ژیانی ئاسایی نادەن، بەڵام خوێنەر پاش

وردبوونەوە لە مەعنای گشتیی بەیتەکان، دەتوانیٚ دەرك بە شتێکی نائاسایی لەو نێوانەدا بکات، بەڵاٚم کە شاعیر لە جیهانی تایبەتی عیشقی حەقیقیدا دەمێنێتەوە یان گۆڕەپانەکە دەگوازێتەوە بۆ ئەو دنیا – ئاخیرەت – بەوشێوەیە هەست بە "ناسایی بوون" ناکرێت، نموونەی مانەوە لەو جیهانە تایبەتەدا ئەم دوو بەیتەیە:

لەبەر قاپیی مەحەببەت ئەو خودا پێداوەیە رووسوور
حەزینە، دیدە پڕ ئەسرینە , دڵ خونینە، رووزەردە

٤ ه ٣، ٢٧٠

وتم بۆ رووت و پووتن ئەو کەسانەی عاشقی رووتن
وتی: شان و شکۆهی زیندە دڵ هەر ژەندە پۆشینە

٩ ه ٥، ٢٨٢

لە هەردوو نموونەدا چونکە ئەو رواڵەتانە بەڵگەی خۆیەکلاکردنەوەن بەو ئاراستەیەی کە تەنها یار بە راستیی زۆر بەرچاو و گەورە دابنرێت و لەوپێناوەدا هەموو شتێك بخرێتەلاوە، ئاساییە ببنە مایەی شانوشکۆ و رووسووری و سەربەرزیی عاشق.

نموونەی گواستنەوەی گۆڕپانیش بۆ ئەودنیا – ئاخیرەت – ئەم دوو بەیتەیە:

چ رۆحیٚ کوشتەی ئەو باڵاٚیە، قومریی داری گووبایە
( فیا طوبی لقومٍ في سبیل الحُبِّ هُم ماتـــوا )

٥ و ٦، ٢٦٣

بە غیبطـە بەو خـــــودا پێداوە ( طوبی لە ) یە ئەهلی خولد
لە کوورەی ناری غەمدایە، بە داغی دەردی تۆ شادە
٣ ەـ ٤، ٢٦٩

دەرەنجام، ونکردنی خود یان "لە خۆ غایب بوون" – بە تەعـبـیری خودی شاعیر – رووبەری ئەو ئەزموونەیە کە خـەرواریـکـی بـەڵـگـەی شیعرەکانی "مەحوی" تانوپۆین و تەنها چەند مشتێکی ئەو خەروارە بـۆ دەرخستنی هەمەڕەنگی و هەمەلایەنیی ئەو ئەزموونە خـرانـەڕوو. ئـەو "ونکردنی خود"ە لە بەیتی (١٢ی ٥، ٣١٨)دا لە تـەعـبـیرکـردن لـە "دەنگی پێی ئەحبابی رۆیوو – دەنگی پێی خۆشەویستانی کۆچـکـردوو" بە "پڕ بە عالەم مەوج ئەدا – پڕ بە جیهان شەپۆلانیەتی"، یەکێـك لـە شێوە ئێجگار نائاساییەکانی ئامێتەکردنی ئەرکی هـەردوو ئـەنـدامـی بەرپرسی هەستی بیستن "گوێ"و هەستی بینین "چاو" بەرجەستەدەکـات. لە شیعری "مەحوی"دا ئەمانە دەکرێ رەنگدانەوەی دوو چەمکی گرنگـی لای سۆفییان بن کە لەهەمانکاتدا دوو بەڵـگـە – ئـایـە–ی گـەورەی مەعشووقیشن، یەکەمیان چەمـکـی "تـەجـەلـلـی–دەرکـەوتـن"ە و سەرچاوەکەی لە ئەزموونی عیشقی حەقیقیدا ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:

(وَلَمَّا جَاءَ مُوسَىٰ لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ. / الاعراف ١٤٣ ) و

دووەمیشیان چەمکی "قسە – کلام"ی یارە کە لای سۆفییەکان موعجیزەی قورئانە و خوای گەورە خۆی لەبارەیەوە رووبەڕووی هەموو بەندەیەك بووەتەوە کە بتوانن تەنها هاوشێوەی یەك سوورەتیشی بهێنن: (وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ / البقرة ٢٣). و (أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ/ يونس٣٨)

نموونەی شیعری "مەحوی" کە باس لە چەمکی "تەجەللی – دەرکەوتن" بکات، ئەمەیە:

بریقەی بەرقی جیلوەی کێ جەلابەخشی بینابیمە
کە قورصی ئافتاب و مەهـ وەکو تەم دێتە بەر چــاوم

**٦ م ٣، ٢٢٣**

نموونەش لەبارەی چەمکی "قسە – کلام"ەوە ئەمەیە:

دەم نادیار نازی قسەی پڕ بە دەشت و شار
دنیایەك ئاوی زیندەگی یو دەرخرێ لە هیچ

**٢ چ ٦، ٩٩**

ئەمە سەرچاوەی ونکردن و لەدەستدانی خودە لەو ئەزموونەدا کـە گەورەترین شانازیی عاشق فەوتاندنی منێتیی خۆیەتی – الإنیّە–یـەتـی،

مەحوی دەڵێ:

ببیە لە من، درەختی ( منی ) لەعنــەتە بەری
یەعنی بکە لە کیبر و ئەنانییەت ئیحتیراز

**١ ز ٨، ١٣٥**

تەنها بۆ بەرزڕاگرتنی هەردوو چەمکی "دەرکـەوتـن – تجـلـی"و "قسە – کلام"یش، مەحوی هەموو بوونی خۆی لە مامەڵەی بناغــەیــی لەگەڵ یاردا، لەنێوان ئەو دوو چرکەدا چڕدەکاتەوە:

لە کن پشکووتنی غونچەی دەمــی، وەك گوڵ، سەراسەر گوێم
گـــوڵـی روخســـاری دەرخا، نێرگـس ئاسا، سەربەسەر چاوم

**٦ م ٤، ٢٢٣**

بە گەڕانەوە بۆ بەیتی (١٢ی ٥، ٣١٨) تەنها کێشەی بەتەنیـایـی مانەوە لەنێوان "کۆمەڵەی یاران" شاعیری بەرەو ئەو گۆشە سـەخـتـەی ئامێتەکردنی دەنگ – دەنگی پێی ئەحبابی ڕۆیوو –و دیمەن – پـڕ بـە عالەم مەوج ئەدا – برد. هۆی ئەم شڵەژانەی ناخ لە کرۆکی مەسەلەکـەدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕەنگە بەخۆداچوونەوەیەك لەئارادابێت، چـونـکـە "بە غەفڵەت موبتەلا" کە "خۆ"ی تێدا بە "تۆ" ناوزەدکراوە مەعـنـای ڕاگرتنی "خود" لەبەرانبەری "خودی سەرزەنشتـکـار" دەبـەخشـێـت و مەبەستیش لێپێچینەوەیە بە هۆی ئەوەوە کە ئەو شوێنەوارە گـەورەیـەی کۆچی خۆشەویستان لە "بێ ئاگایی" دەریـنـەکـردووە . ئـەم بـەیـتـە ڕەنگدانەوەیەکی هونەرمەندانەتری بەیتیدیکەی خـودی "مـەحـوی"یـە، وەکو:

هەتا ماوە دەبێ ئەشکی نەدامەت داوەرینێ چـــاو
عەرەق ریتــن نەبێ، شەخصی لە کاری خۆ خەجڵ چبکا ؟
**٥ أ ٤، ١٤**

ئەجەل دەورم دەدا: حاضر بە وادەی دەور و تەسلیمە
منی غەفڵـەت زەدە هێشـــتا خەریکی مەسئەلەی دەورم
**٥ م ٣، ٢٢٠**

●●●

